# بەڵگە ڕوونەکان

## سەبارەت بە هەڵوێستی ئیمام أحمد بەرامبەر بە جەهمیەکان

ئامادەکردنی:

سيف الله السني

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله والصلاة والسلام على من لا نبي بعده :**

**أما بعد :**

ئەوەی ئێستا لەبەر دەستتان دایە بریتیە لە کتێبێکی بچووك و پوخت بەڵام زۆر گرنگ ئەویش بریتییە لەباسێك لەسەر هەلوێستی ئیمام أحمد بەرامبەر جەهمیەکان لە کافرکردنیان و دوعا لێکردنیان و نوێژنەکردن لەدوایان ئەوانەش هەمووی بەرامبەر کەسی معین (دیاریکراو) ، ئەوەشی کە پاڵنەرم بوو بۆ نوسین و ئامادەکردنی ئەو کتێبە ریساڵە و نامیلکەیەکی بچووکی برایەکی بەرێزبوو الله لێی ڕازی بێت ، بینیم کە نامیلکەکەیەکی بچوکی زۆر بەسوودە بەڵام پێویستی بەبەلگە و قسەکردن و زیاتر فراوانکردنی هەبوو ، وە ئەم کتێبە بەلگەیەکی بڕاوە و جەرگبڕە بۆ ئەهلی باطڵ و هەوا و ئارەزوو لەمورجیئە و شوێنکەوتوانی جەهمی ئەو سەردەمە ، وە ویستمان بەڵگەی زیاتر و فراوان تری بکەین چونکە بەڵگەکان گەلێ لەوە زیاترن کە باسکراوە لەسەر تەکفیرکردنی ئیمام أحمد بۆ جەهمیەکان و دوعا لێکردنیان و نەفرەت لێکردنیان و نوێژنەکردن لەدوایان و فەرمان کردن بەوە هەتاوەك لەدوای مردنیشیان .

گومانی تێدا نییە کە وەك دەبینین ئەو باسە زۆر دەکرێتەوە و قسەی لەسەر دەکرێت و بووەتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵێك لەغلوچیان (زێدەڕۆیان) هەڵساون بەتەکفیرکردنی ئیمام أحمد پەنا بە الله ، وە کۆمەلەیەکیش گومانی ئیرجاء و بوهتانی تەکفیرنەکردنی جەهمیەکانیان داوەتە پاڵ امام أحمد لەوەی کە تەکفیری معینی (کەسی دیاریکراوی) نەکردووە بەنەفامی خۆیان وای تێگەشتوون ، وە کردویانەتە قەلغانێك بۆ تەکفیرنەکردنی طاغوتان و گۆڕپەرستان ، بۆ ئەوەش پشتیان بەچەند وتەیەکی ابن تیمیە بەستووە ، لەوتەکانیشی :

وەك گوتویەتی : ( بەڵام کەسانی معینی ( دیاریکراوی ) جەهمیەکانی تەکفیر نەکردووە ، چونکە ئەوەی بانگەوازی بۆ وتەیەك بکات زۆر زۆر گەورەترە لەوەی دەیلێت ئەوەشی کە سزای ئەدات لەسەری زۆر گەورەترە لەو کەسەی بانگەوازی بۆ دەکات ، ئەوەشی تەکفیری پێچەوانەی دەکات زۆر گەورەترە لەوەی کە تەنها سزای ئەدات ، لەگەڵ ئەوەش لەو کەسانەی کە کاربەدەست بوون و قسەی وەك جەهمیەکانیان دەکرد : کە قورئان مخلوقە و الله لەقیامەتدا نابینرێت و هاوشێوەی ئەو باسانە ، وە بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ ئەوە و تاقیان دەکەنەوە و سزایان دەدەن ئەگەر وەڵامیان نەدابوایەوە ، تاوەك ئەگەر کەسێکیان بگرتبوایە ئازادیان نەدەکرد هەتاوەك دان

بەقسەی جەهمیەکان نەنێت بەوەی قورئان دروستکراوە و هاوشێوەی ئەو باسانە ، هەرگیز کەسیان سەرنەدەخست و دۆستایەتیان نەدەکرد وە بەشیان نەدەدا لە ( بیت المال ) دا بەهیچ کەسێك مەگەر ئەو کەسەی کە قسەی ئەوانی بکردبوایە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمام أحمد ڕەحمەتی بۆ ناردون و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون بە زانستەکەی بەوەی پێغەمبەرەکەیان بەدرۆنەخستۆتەوە و نکۆلیان لەو شتە نەکردووە کە هێناویەتی ، بەڵام تەئویلیان بۆ دروستبوو بوو و هەڵەیان کرد و لاسایی ئەو کەسانەیان کردەوە کە ئەو قسە و جۆرە دەربڕینانەیان دەکرد )[1] .

وە وتەکەی : ( ئینجا ئیمام أحمد پاڕاوەتەوە بۆ خەلیفە و غەیری ئەویش لەو کەسانەی کە ئازاریاندا و زینـدانیان کرد داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن ، لەو شتانەی کردیان لەستەم و زۆرداری وە دوعاکردن بۆیان لە قسەیەك کە کوفرە و کردویانە ئەگەر هەڵگەڕاوە بن لەئیسلام ئەوا دروست نەدەبوو دوعا بۆ کردنیان!!! )[2] .

وە وتەکەی : ( بەڵکو نوێژی لەدوای جەهمیەکان کردوە کە بانگەوازی وتەکانیان کردووە و خەلکیان تاقی کردۆتەوە ، وە ئەو کەسەیان

(1) مجموع الفتاوى : (23/248) .

(2) مجموع الفتاوى : (12/489) .

سزاداوە کە موافەقەیانی نەکردووە بەسزای توند ، وە أحمد و هاوشێوەکانی ئەوانیان کافرنەکردووە ، بەڵکو ئیمان وە ئیمامەتی تێیاندا دەبینی وە تێکەلاو بوون و نوێژکردنی لەدوایان بە دروست دەزانی وە بەهەمان شێوە حەج و جیهاد کردن لەگەڵیان و ڕێگری کردن لە دەرچوون لێیان )[3] .

پوختەی وتەکەی ابن تیمیة ئەوەیە کە ئیمام أحمد جەهمیەکانی بەدیاریکراوی ( معین ) تەکفیر نەکردووە بەلکو متەئەویل بوون و بەلگەش ئەوەیە کە نوێژی لەدوا کردوون و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون و ڕێگری کردووە لە دەرچوون لێیان و .........هتد .

گومانی تێدا نییە کە شیخ الاسلام یەکێکە لەگەورە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەڵام وەك دەزانین و ئەمە مەنهەجی هەموو کەسێکی موەحیدی سوننییە کە هەموو کەسێك قسەی وەردەگیرێت و ڕەتدەکرێتەوە تەنیا ئەگەر موافقی هەق بێت وەردەگیرێت .

وە دەگوترێت ئەو پشتبەستنەی ابن تیمیة تێکەڵاوی تێدایە و پێوستە قسەی لەسەر بکرێت لەگەڵ ئەوەشی کە هەموو ئەو بەڵگانەی

(3) مجموع الفتاوى : (7/507) .

باسیان دەکەین ڕەتی وتەکانی ابن تیمیة دەکەنەوە و پێچەوانەیەتی ، وەك بەلگەکان دێن بە ویستی الله و زۆرێك ئەو تێگەشتنەی إبن تیمیەیان کردووەتە دەرفەتێك بۆ داخستنی دەرگای تەکفیر بەرامبەر گۆڕپەرستان و عەلمانی و طاغوتان و شوێنکەوتوانیان و سەربازەکانیان بەبیانوی **عوزر بەجەهل و تەئویل** وە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوە مەنهەجی ئیمام أحمدە لە بابی تەکفیردا بۆ سەرخستنی مەنهەجە ئیرجاء و جەهمیەتەکەیان کە ئەو قسانە هەمووی پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتانەن کە لە ئیمامی أحمدەوە هاتووە وە دەلێن ئیمام أحمد سێ خەلیفەکەی کافر نەکردووە لەگەڵ ئەوەش بەڵگەکان ڕوونن لەوەی کە سەرەتا ئیمام أحمد تەکفیریانی کردووە و بەخراپ باسی کردوون بەڵام هەندێکیان دواتر تەوبەیان کردووە و پەشیمانبونەتەوە لەفیکرە و بیروباوەڕی جەهمیەت وەك بەلگەکان دێت بەویستی الله .

بەهەر حاڵ ئێمە هەڵوێستی ئیمام أحمد ڕوون دەکەینەوە بەرامبەر جەهمیەکان .

ئەو باسەش دابەش دەکەین بۆ چەند **پرسێك** :

**پرسی یەکەم** : کۆدەنگی سەلەف لەسەر تەکفیرکردنی جەهمیەکان .

**پرسی دووەم** : کۆدەنگی سەلەف لەسەر نوێژ نەکردن لەدوای جەهمیەکان .

**پرسی سێیەم** : چەند نمونەیەك لەتەکفیرکردنی ئیمام أحمد بۆ (معين ـ کەسی دیاریکراو) ی جەهمیەکان لە زاناکان .

**پرسی چوارەم** : چەند نمونەیەك لەتەکفیرکردنی ئیمام أحمد بۆ (معين ـ کەسی دیاریکراو) ی جەهمیەکان لەکاربەدەستانی دەولەت .

**پرسی پێنجەم** : هەڵوێستی ئیمام أحمد لەسەر هەرسێ خەلیفەکە کە بانگەشەی بیروباوەڕی جەهمیەتیان کردووە .

**پرسی شەشەم** : حوکمی جەهمیەکان وەك حوکمی کافرەکانە لەهەموو حوکمەکانی دین .

**پرسی حەوتەم** : وەڵامدانەوەی گومانەکانی پێچەوانان .

**پرسی هەشتەم**: هەندێك بەڵگە لەوتەی زانایانی سەلەف و خەلەف بۆ سەلماندنی ئەوەی کە باسمان کرد .

الله ـش ڕێنمونی کارە هەر ئەویشمان بەسە و چاکترینی پشت پێ بەستوانە .

خوایە هەقمان بەهەق نیشان بدە و شوێنکەوتنیمان پێ ببەخشە وە باطڵمان بە باطڵ نیشان بدە و دوورکەوتنەوەمان لێی پێ ببەخشە .

نوسینی : **سيف الله السني** .

## پرسی یەکەم
## کۆدەنگی سەلەف لەسەر تەکفیرکردنی جەهمیەکان

گومانی تێدا نییە کە هیچ کەسێك گومانی لە کافربوونی جەهمیەکان نابێــت مەگەر ئەقــڵ توشــبووێك نەبێــت چــونکە کوفرەکانیــان زۆر گەورەتــرە لە کــوفری گــاور و جولەکەکــان ، وە هۆکــاری کافربوونیــان بەهۆی چەندین کوفرەوەیە کە هەیانە گەورەترینیان :
پەکخســتنی صــیفەتەکانی الله و بەتــایبەتی صــیفەتی ( الإســتواء ) و تەئویل کردنی بە ( استولی ـ دەست بەسەرداگرتن ) و گوتنی خەلقی قورئان و نکۆڵی کردن و تەئویل کردنی ئایەتەکانی بینینی ئیمانداران بۆ الله تعالی لەڕۆژی قیامەت و....... زۆرێکی تر .

ئیمامی اللالکائي دوای ئەوەی کۆدەنگی نەقڵ دەکات ووتەی (550) ئیمامی هێنایەوە لەسەر کافرکردنی ئەو کەسەی بڵێت قورئان مخلوقە .
فەرموویەتی : ( ئەگەر سەرقاڵ ببوایەم بەهێنانەوەی وتەی زانایان ئەوا ناوەکانیــان دەگەیشــت بە بەچەنــدین هەزار ، بەڵام کــورتم کــردۆتەوە و ســەنەدەکانم ڕەشــکردۆتەوە بــۆ کــورتکردنەوەی و زۆر درێژنەکردنەوەی ، وە لەو زانایـانەوە سـەردەم لەدوای سـەردەم نەقڵم کردووە و هیچ **کەسێك نکۆڵی لە قسەکەیان ناکات ، ئەوەشی نکۆڵی**

**بکات لە قسەکەیان ئەوا داوای تەوبەیان لێ دەکرد ، یاخود فەرمانیان دەکرد بە کوشتنی یاخود دەرکردنی یاخود لە خاچ دانی )**[4] .

وە بەهەمان شێوە ابن القیم رحمه الله کۆدەنگی نەقڵ دەکات لەسەر تەکفیرکردنیـان کە لەنونیەکەیـدا لەوەی هەریەکە لە ئیمـام لالکـائي و پێش ئەویش طبراني و بەهەمان شێوە حربي کرماني لە عقیدەکەیدا .

بەهەمــان شــێوە ئەوانەی **نکــۆڵی بینینــی** الله دەکەن لە قیامەتــدا کۆدەنگی دامەزراوە لەسەر کافربوونیان .

ابن خزیمة فەرموویەتی : ( ئەو کەسەی نکۆڵی لە بینینی الله دەکات لە قیامەتدا ئەو کەسە لای ئیمانداران زۆر خراپترە لە گاور و جولەکەکان و مەجوس وە **ئیماندار نین لای هەموو ئیمانداران )**[5] .

بەو شێوەیە ئیمام کۆدەنگی نەقڵ دەکات لەسەر ئەوانە کە موسڵمان نین و زۆر خراپترن لە گاور و جولەکەکان .

ئەوەیشــی بلــێ لەکـاتی کـافرکردنی جەهمـیەك پێویســتی بە لاچــوونی ڕێگرییەکان و مەرجەکان هەیە ئەوا پێویستە لە کاتی کافرکردنی معینی گاور و جولەکەکان ( کەسێکی دیاریکراوی گاور و جولەکەکان ) بڵێت

(4) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة : (2/312) .

(5) اجتماع جيوش الإسلامية : (2/194) .

پێویستی بە لاچوونی ڕێگرییەکانی تەئویل یاخود جەهل هەیە بۆ کافرکردنی ئەوەش هیچ موسڵمانێك قسەی وا ناکات ! .
بەهەمان شێوە کۆدەنگی دامەزراوە لەسەر ئەو کەسەی کە نکۆڵی لە صیفەتی ( **إستواء** ) بۆ الله تعالی بکات یان تەئویلی بکات و جێگیری نەکات بەهەر هۆیەك بێت کافرە و هیچ عوزری تێدانییە و لەو باسانەیە کە **بەپێویست زانراوە لەدین** و ئەوەشی جێگیری نەکات ئەوا لەگەردەنی دەدرێت و تەرمە بۆگەنەکەی فڕێ ئەدرێتە زەباڵەوە بۆ ئەوەی موسڵمانان نارەحەت نەبن بە بۆنە بۆگەنەکەی وەك ابن خزیمة فەرموویەتی .

ابن تیمیة لە مجموع الفتاوی فەرموویەتی : ( بۆیە سەلەف کۆدەنگ بوون لەسەر کافرکردنی جەهمیەکان چونکە ئەو باسە لایان لە مەسائیلی پێویست زانراوە لەدین و بەهەمان شێوە ئەو کەسەی تەئویلی ( **إستواء** ) بکات بە ( **استیلاء** ) ئەوە **بەکۆدەنگی سەلەف ئەو کەسە جەهمیە و کافرە** )[6] .

وە بەهەمان شێوە ئیمام عثمان الدارمي رحمە الله کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نەقڵ دەکات لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە

(6) سەیری مجموع الفتاوی بکە : (6/468) .

دان بە إستواء الله تعالى دا نەنێت وەك لەکتێبی ( الرد على الجهمية ) فەرمـوویەتی : ( بـۆیە ئـێمە **کافریـان دەکەیـن** ( واتە جەهمیەکـان ) چونکە نازانن الله لەکوێیە وە وەسفی ناکەن بەوەی لەکوێیە ) .
وە وتەی سـەلەف لەسـەر ئەوەی کە کـوفری جەهمیەکـان خراپتـرە لە کـوفری گـاور و جولەکەکـان گەڵێـك زۆرە ئەوەشـی دەیەوێـت زیـاتر بزانێت و ببینێت با بگەڕێتەوە سەر کتێبەکانی : الإبانة الكبرى و شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة و هاوشێوەی ئەو کتێبانە .

وە ئیمـام ئیسـماعیل الأنصـاري کتێبێکـی گەورەی دانـاوە لەسـەر تەکفیرکردنی جەهمیەکان و ناوی بردووە بە ( تكفير الجهمية ) .
وە ئەگەر بە درێژی و فراوانی ئەو وتە و کۆدەنگیانەمان باس بکردبوایە ئەوا درێژ دەبویەوە بەڵام نامانەوێت زۆر سەرنجی خوێنەر ڕابکێشین چـــونکە وتەکانیـــان زۆربەی گشـــتییە و بە ڕەهـــایە و لەوانەیە تێگەیشتنێکی وای لێوەربگیرێت کە ببێتە هۆی جیاوازی نەکردن لە لەنێوان تەکفیری غیر معذب و تەکفیری معذب .

وە مەبەستیش لە تەکفیری معذب و تەکفیری غیر معذب :
**تەکفیری غیر معذب** : بریتییە لەوەی ئەو کەسەی توشی کوفر یاخود شیرك بووە ناوەکەی موشریك و کافرە لەدونیادا و لەفزەکانی ( فاسق و

زاڵـم و كـافر و موشـریك ) لەسـەر دەچەسـپێت بە تەنهـا ئەنجامـدانی فسق و كوفر و شیرك زوڵمەكە .

**تەكفیـری معـذب** : بـریتیە لەوەی كە تەكفیركردنــی كەســی توشــبوو بەشیرك یاخود كوفر و شایەدی دانی جەهەننم بۆی وەستاوە لەسەر داوای تەوبە لێكردنی كە اقامە حجەیە .

وە ئەو باسـەش پەیوەسـتی بە باسـی ( أسـماء والأحكـام ) كە بـریتییە لەوەی مەرج نییە ئەو كەسەی كە لە دونیا كافر بێت زاهیرەن لەفزی كوفر و شیركی بچێتە سەر بەڵام حوكمی قیامەتی كافر بێت و شایەدی قیامەتی بە كوفر بۆ بدرێت لەوانەیە عوزری بەجەهلی هەبێت ئەوەشی كە ئەهلـی سـوننەت و جەمـاعەت لەسـەرین لەباسـی عـوزر بەجەهەڵ ئەوا لە سێ جۆرە كەس زیاتر عوزریان بۆ نییە :

**یەكەم** : ئەو كەسەی تازە موسڵمان بوبێت كە پێی دەگوترێت ( **حدیث العهـد** ) چـونكە ناتوانێـت بەو مـاوە كەمەی موسـڵمان بـوونی هەمـوو شـتێك بزانێـت ، بەڵـگەش بـۆ ئەوە هـاوەڵان لە جەنگـی حونەینـدا بە پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم ) یان گوت : دارێكمان بۆ دابنێ بـۆ تەبەڕووك كـردن و چەكـی خۆمـانی پێـوە هەڵواسـین وەك چـۆن موشـریكان هەیـانە ، وە فەرمـوودەكەش أحمـد و ترمـذي ڕیوایەتیـان

كردووە و قسەی زۆر لەسەر فەرموودەكە دا هەیە بەهەرحاڵ بەو هۆیە ئەوەی تازە بێتە ناو ئیسلام یان ماوەیەكی كەمە هاتوەتە ناو ئیسلام ئەوا عوزری هەیە بەهۆی ئەوەی كە ناتوانێت لەو ماوەیە كەمە فێری هەموو بوارەكانی دین ببێت لە تەوحید و فیقهەوە .

**دووەم** : ئەو كەسەی لە شوێنێكی دوور لە موسڵمانان بژیت كە پێی دەگوترێت ( **المنشئ ببادية البعيدة** ) و توانای داواكردنی علمی شەرعی نەبێت لەگەڵ ئەوەش كە هەوڵی بۆ دەدات بۆ فێربوونی ئەو كەسەشیان معذورە .

**سێیەم** : ئەو كەسەی نەفام بێت و بكەوێتە ناو شتێك یان باسێك لەباسەكانی ناو و صیفاتەكانی الله تعالى ( الأسماء والصفات ) كە ئەو باسانە شاراوەن و عامی خەڵكی نایزانن ئەوانەش مەعذورن بەبەڵگەی ئەو پیاوەی كە گوتی بمسوتێنن لەترسی الله بەوەی كە الله دەسەڵاتی نەبێت لەوەی زیندووی بكاتەوە وكە الله زیندووی كردەوە پرسیاری لێكرد بۆچی ئەو وەسیەتەت كرد گوتی لە ترسی تۆ ئەی الله ، ئەو فەرموودەیەش لەگەڵ ئەوەی قسەی زۆری زانایانی لەسەرە هەندێكیان فەرموویانە مەبەستی لەوە نەبووە وە هەندێكیان بۆ ئەوە چوون كە تازە موسڵمانبووبوو ئەو كەسە وە هەندێكیان بۆ ئەوەچوون كە ئەو كەسە

لەشـوێنێکی دوور لە موسـڵمانان ژیـاوە ، بـۆیە قسـەی زۆری لەسـەرە بەهەر حـاڵ کەسـێك لەو باسـێك لەو باسـانەی نـاو و صـیفاتەکان تێبکەوێت عوزری هەیە و کافر ناکرێت ، والله اعلم .

وە ئەو قاعدەیەی تەکفیری معذب و غیر معذب کۆدەنگی لەسەرە وە بەلگەی ڕوونیشی لەبارەوە هاتووە لە قورئان و سوننەت ، بۆیە زۆرێك لەسـەلەف ئەگەر تێکڕاشـیان وا نەبـن بەڵام زۆربەیـان کاتێـك کە پرسیاری کەسی جەهمیان لێدەکرێت ، دەفەرموون : ( **کافرە** ، داوای تەوبەی لێدەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا لە **ملی دەدرێت** ) بۆیە لەیـەکەمـدا نـاوی کافریـان بەسـەردا چەسـپاندووە بەتەنهـا بەوەی کەسـێکی جەهمـیە بەبـێ ئاوڕدانەوە لەوەی ئایـا جـاهلە یـان مـتەئەویلە..... ئەوەشـیان تەکفیـری غیـر معـذبە ، اقـامە حجەشـیان بەستوەتەوە بە داوای تەوبە لێکردن کەداوای تەوبە لێکردنەکە بریتیە لە اقامە حجە و هیچ پەیوەندی نییە بەوەی ئەو کەسە لەدونیادا ناوی کوفر و شیرکی بەپێی کارەکەی لەسەر دەچەسپێت ، والله اعلم .
وە بەلگەکان زۆرن لەسەر ئەو باسە لە قورئان و سوننەت و بەهەمان شێوە زۆر بەڕوونی بەدیار دەکەوێت لە مەنهەجی ابن تیمیە و محمدی کوڕی عبدالوهاب کە شێخ محمد رحمە الله کتێبێکی داناوە لەسەر ئەو باسە و ناوی بردووە بە ( مفید المستفید في کفر تارك التوحید ) .

وە بەهەمان شێوە شێخ اسحاق بن عبدالرحمن ڕیسالەیەکی نوسیوە لەسەر باسەکانی تەکفیری معین و ناوی بردووە بە ( تكفير المعين والفرق بين قيام الحجة وفهم الحجة ) ڕیسالەیەکی بەسوودە هەرکەسێك بیەوێت شارەزای ئەو باسا ببێت با بگەڕێتەوە سەر ئەو کتێبانەی کە باسکران .

وە لێرەدا شتێك هەیە کە پێویستە ئاماژەی پێ بدەین ئەویش ئەوەیە کە ئەو سێ جۆرە کەسەی کە باسمان کرد بەو پێیەی عوزریان هەیە ئەوانەن کە جەهلیان هەیە بەهۆی ئەو سێ هۆکارەوە نەك کەسێك پشت هەڵبکات لەدین یاخود نکۆڵی بەڵگەکان بکات ئەو سێ جۆرە عوزرەش بە موتڵەقی ( ڕەهایی ) نییە بەڵکو ئەوکاتە ئەو عوزرانە قبوڵە کە کەسەکە پشتی لەدین نەکردبێت و جەهلەکەی بەهۆی **پشتهەڵکردنی** لەفێربوونیەوە نەبێت و کەمتەرخەمی لێ نەکردبێت .

ابن تیمیە فەرموویەتی : ( عوزر نابێتە عوزر مەگەر لەکاتی توانا نەبوون بۆ لابردنی ئەو عوزرە ، بەڵام هەرکاتێك مرۆڤ توانای فێربوونی هەقی هەبوو بەڵام کەمتەرخەمی کرد لەفێربوونی ئەوا ئەو کاتە **عوزری نییە** )[7] .

(7) مجموع الفتاوى : ( 280/20 ) .

وە محمد امین شنقیطي فەرمووویەتی : ( بەڵام ئەو کەسەی توانای هەبێت بۆ فێربوونی دین و کەمتەرخەمی تێدا بکات ئەو کەسەش ڕاوبۆچوونی پیاوانێك پێش بخات بەسەر ئەوەی زانیویەتی لە وەحیدا ئا ئەو کەسانە **عوزریان نییە** )[8] .

بەو شێوەیە ئەو کەسەی کەمتەرخەمی بکات لەفێربوونی دین و لەسەر ئەو شرك و کوفرەی خۆی بمێنێتەوە یاخود توشیان ببێت ئەوا عوزری بۆ نییە بەڵکو توشی هەڵوەشێنەرەوەیەك لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام بووە کە ئەویش هەڵوەشێنەرەوەی دەیەمە کە پشتهەڵکردنە لە یاد و زیکر و فێربوونی دینی الله .

ابن القیم فەرمووویەتی : ( هەموو کەسێك کە **پشت هەڵبکات** لەدەستگرتن بەوەحی الله کە بریتییە لە زیکر و یادی الله ئەوا گومانی تێدا نییە کە پێویستە لەڕۆژی قیامەتدا ئەوە بلێت ، جا ئەگەر گوترا : ئایا عوزر هەیە بۆ ئەو کەسە لەو گومڕاییەی کەوا وا گومان دەبات کە لەسەر ڕێگای ڕاستە ، وەك الله فەرمووویەتی : ( ویحسبون أنهم مهتدون ) ئێمەش دەڵێین : **هیچ عوزرێك نییە** بۆ ئەو جۆرە کەسانە و هاوشێوەکانیان لەو گومڕاییەی کە بنچینەی گومڕاییەکەیان دامەزراوە

(8) (423/7) .

لەسەر **پشت هەڵکردن** لەو وەحیەی کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆی هاتووە ، وە ئەگەر گومانی وای برد کە ڕێنمونی کراوە ئەوا وانییە بەڵکو کەمتەرخەمە لە پشت هەڵکردن لە شوێنکەوتەی بانگەوازی هیدایەت ! جا ئەگەر گومڕا بوو ئەوا **هۆکارەکەی ئەو کەمتەرخەمی و پشت هەڵکردنەیە کە لەلایەن خۆیەوە بووە** )[9] .

وە فەرموویەتی : ( **پشتهەڵکەر** لە تەوحید **موشریکە** بیەوێت یان نەیەوێت وە پشت هەڵکەر لە سوننەت بیدعەچیە بیەوێت یان نەیەوێت )[10] .

بەو شێوەیە ئەوەی کەمتەرخەمی بکات لە دین و فێربوونی عوزری نییە بەهیچ شێوەیەك بۆیە هەرکاتێك هەر یەکێك لە زانایان گوتبێتیان عوزر هەیە ئەوە مەبەستیان لەوەیە کە ئەو کەسە جەهلێکی هەیە کە هەوڵی فێربوونی دین دەدات بەڵام پێی ناگات نەك کەسێك کە پشت هەڵبکات لەدین ئەوا ناچێتە ژێر وتەکەیان ، لەسەر ئەوە باس و خواسی عوزر بەجەهل لای زانایان بەو شێوەیەیە .

(9) مفتاح دار السعادة : (44/1) .

(10) إغاثة اللهفان : (214/1) .

جـگە لەوەش ئیمـام أحمـد جیـاوازی نەکـردووە لەنێـوان کەسـی زانـا و جاهل و لاساییکەرەوە لەباسی گوتنی قورئان مخلوقدا بەڵکو وتەکانی گشـتیە هەمـوو کەسـێك دەگـرێتەوە جـا زانـا بێـت یـان جاهـل یـان لاساییکەرەوە .

ابــن تیمــیە فەرمــوویەتی : ( لەســەر کەســی معینــی جەهمــی هــیچ بەڵگەیەکـم پـێ نەگەشـتووە تـاوەك ئێسـتا لە پەیوەسـتکردنی بەوەی کەسەکە تەنها **بانگەوازی بۆ جەهمیەت بکات** )[11] .

وە ابن رجب فەرموویەتی : ( نەگەیشتووین بە بەڵگەیەك سەبارەت بە کەسـی جەهمـی کە ڕیـوایەت کرابێـت ئـەگەر بـانگخواز نەبێـت ئەوە جەهمی نییە ، بەڵکو **وتەکانی گشتیە** ) .

ئەمەیان لەسەر وتەکەی بۆ گشتی و جیاوازی نەکردن لەنێوان کەسی بێـژەری قـورئان مخلـوق و لەنێـوان لاسـاییکەرەوە و جاهـل هۆکـاری جیـاوازی نەکـردنەکەش ئەوەیە کە تەکفیرکردنـی جەهمیەکـانی دەڵـێن قورئان مخلوقە بە پێویست زانراوە لەدین .

بەڵام لەوانەیە ئیمام أحمد جیاوازی کردبێت لەنێوان ئەو کەسانەی کە توشــی هەنــدێك لە وتە و دەربڕینەکــانی جەهمیەکــان بــووبن وەك

(11) المسودة : (236) .

بگوترێت قورئان قسەی الله یە بەڵام بڕیاری **وەستان** بدرێت لەوەی بگوترێت مخلوقە یاخود نا ، ئەو کۆمەڵەیەش پێیان دەگوترێت (الواقفية) وە ئەو کەسەی کە بڵێت گوتنەوەی ئێمە بۆ قورئان مخلوقە ئەوانەش ناودەبرێن بە ( اللفظية ) .

عبدالله کوڕی أحمد فەرموویەتی : ( گوێم لێ بوو پسیار کرا لە باوکم سەبارەت بە لەفزیەکان و وەستاوان لەقورئان ؟ فەرمووی : هەرکەسێك **جاهیل** بێت با پسیار بکات و فێر ببێت )[12] .

بەهەمان شێوە ئەو پرسیارە لە ئیمام کراوەتەوە ، فەرمووی : (هەرکەسێك لەو کەسانە دەربڕینی باش بێت و **زانا** بێت ئەوا ئەو کەسە جەهمیە )[13] .

وە عبدالله فەرموویەتی : ( گوێم لێ بوو پرسیار دەکرا لەباوکم سەبارەت بە وەستاوان لە قورئان ، باوکم فەرمووی : ئەو کەسەی ملمڵانێ لەسەر قسەکانی بکات و زانا بێت ئەوا جەهمیە ، ئەوەشی نەی زانێت **دووردەکەوێتەوە** لەوە تاوەك بەگەڕێتەوە لەو قسانە ، ئەو کەسەی زانیاریشی لەسەر نەبێت پرسیار دەکات و فێر دەبێت )[14] .

(12) السنة لعبدالله : (165) .

(13) السنة لعبدالله : (185) .

(14) السنة لخلال : (5/130) .

وە ابـو بكـر مـروذي فەرمـوویەتی : ( پرسـیارم کـرد لە بـاوکی عبـدالله : سـەبارەت بەو کەسـەی وەسـتاوە لە قـورئان و نالێـت مخلـوق نیـیە ؟ فەرمـووی : مـن دەلـێم وتەی الله یە ، بەو کەسـە دەگوترێـت : زانایـان دەفەرموون : مخلوق نییە ، جا ئەگەر وەرینەگرت ئەوا **جەهمیە** )[15] .

بەو شێوەیە ئیمام أحمد جیاوازی کردووە لەنێوان جەهمیەکان و ئەو کەسانەی کە توشی چەند وتەیەکی گومانـاوی جەهمیەکـان بـوون لە جاهیلەکان چونکە ئەو بابەتانە لەمەسائیلی شاراوەن لەوانەیە هەموو کەسێك نەیزانێت بەلام ئەگەر زانا بێت ئەوا **جەهمیە** و **کافرە** ، چونکە نەگـوتنی مەخلـوقە یـاخود نـا وە لەفـزی قـورئان مخلـوقە ئەوە ڕێـك مەنهەجی جەهمیەکانە وەك گوتنی خەلقی قورئانە بەلام شاراوەترە ، ئەوەش کاتێك سەریهەلدا کە خەلیفە متوکل بەرەنگاری جەهمیەکـان بویەوە جا جەهمیەکان بەشێوەیەکیتر هاتنەمەیدان کەلەجیاتی ئەوەی بلێین قـورئان مخلـوقە گوتیـان گـوتنەوەی ئـێمە بـۆ قـورئان مخلـوقە وە هەردووکیشی یەك مەبەستی لەپشت بوو ئەویش پەکخستنی صیفەتی قسـەکردن بۆ الله و گـوتنی قـورئان مخلـوقە و ئیمـام أحمـد پێـی زانـین ، بەو دەربڕینە هاتنەوە مەیدان بۆ ئەوەی سەر لەخەلکی بشێوینن .

(15) السنة لخلال : (5/130) .

ئەوەش بۆ ئەو کەسەیە کە جاهیلە ، بەڵام جەهمیە هەقیقیەکان کە ئەوانەی وا دەزانن کە الله لەسەر عەرشی خۆی نییە و یاخود صیفەتەکان تەئویل دەکەن یاخود دەڵێن الله لەناو ئەو جیهانە نییە و نە لەدەوروبەریەتی و نە لێشیان جیایە و نە لەسەروویانە و نەلە شتێك نزیك دەبێتەوە و نەهەموو شەوێك بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێت و نە خۆیشی دێت بۆ حساب کردن لەنێوان خەڵکیدا و نەدەستی بۆ بەرز دەکرێتەوە و نە بەپەنجە ئاماژەی شوێنی دەدرێت و نە ئیمانداران دەتوانن ببینن لە قیماتدا و نە قسەی کردووە و نەدەیکات و نەدەجولێتەوە و نە قسەی لەگەڵ دەکرێت و نە ئەویش قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات و زانستی نییە و قودرەتی نییە و نە گوێ و نە چاو و نە توانینی نییە و نەڕووخسار و نە دەست و نە قاچ و نەدەست و پەنجە و وێنەی نییە و نە لە شوێنێکی دیاری کراوە ...... هتد ، لەو کوفریانەی کە ڕوون و ئاشکران ئیمام بەهیچ شێوەیەك جیاوازی نەکردووە لەنێوان کەسی زانا و بانگخواز و جاهل و لاساییکەرەوە و عوزری بۆ نەهێناونەتەوە بەڵکو بەڕوونی تەکفیری کردوون .

بەهەمان شێوە زۆرێك لەزانایانی ئومەت جیاوازیان نەکردووە لەنێوان کەسی جاهیل و زانا ئەوەش وەك لەبەڵگەکان باسمان کرد بۆ ئەو باسانەیە کە شاراوەن وەك لەفزیەکان و وەستاوەکان .

ئیمامی عبدالرحمنی كوڕی باوكی حاتم **كۆدەنگی** (3000) لەزانا و ئیمامەكانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نەقڵ دەكات لەوانەی كە بینیویەتی و پێیان گەیشتووە .
فەرمووویەتی : ( وە **جەهمیەكان كافرن** و ڕافضة ئیسلامیان ڕەتكردۆتەوە ، وە خەوارجیش لەدین دەرچوون و ئەوەی وابزانێت قورئان مخلوقە كافرە بە اللە تعالی كوفرێك كە لەمیلەتی ئیسلامی دەباتەدەر ، وە ئەوەیشی گومانی هەبێت لە كافربوونی ئەو كەسە لەو كەسانەی كە تێدەگەن ئەوا وەك ئەو كافرن ، وە ئەوەشی گومانی هەبێت لە قسەی اللە تعالی دا و وەستا و گومانی هەبێت و بڵێت : نازانم مەخلوقە یاخود نا ، ئەوا جەهمیە ، ئەوەیشی بوەستێت لە قورئان و جاهلیل بێت ئەوا دەبێتە بیدعەچی و كافر ناكرێت )[16] .

بەو شێوەیە سەلەف و زانایانی ئوممەت گومانیان لە كافربوونی جەهمیەكان بە معینی ( دیاریكراوی ) نەبووە جگە لەو باسانەدا نەبێت كە شاراوەن وەك لەفزی قورئان و وەستان لە قورئان ئەوەش بۆ ئەو كەسانەی كە جاهیلن بەڵام ئەو كەسانەی بە بانگەشەی بۆ دەكەن كافر و زەندیقن .

(16) اصول اعتقاد الدين لإبن ابي حاتم .

## پرسی دووەم

## کۆدەنگی سەلەف لەسەر نوێژنەکردن لەدوای جەهمیەکان

گومانی تێدا نییە کە سەلەف رحمهم الله بەکۆدەنگی ڕێگریان کردووە لەوەی نوێژ لەدوای کەسی جەهمی بکرێت و مەگەر بۆ ترسان لەنەفسی خۆیان نەبێت لەوەی توشی کێشە ببن فەرمانیان کردووە بەوەی نوێژیان لەدوا بکەن و دوایش نوێژەکەیان دووبارە بکەنەوە چونکە نوێژ لەدوای کافر بەتالە .

ابن قدامە فەرموویەتی : ( بەهیچ شێوەیەك دروست نییە کافر نوێژی لەدوا بکرێت لەهەر کات و حاڵەتێکدا ، جا ئەگەر کوفرەکەی بزانرێت لە پێش ئەنجامدانی نوێژەکە یان لەدوای ئەنجامدانی ، ئەوا پێویستە لەسەر ئەو کەسەی نوێژی لەدوای کردووە **نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە** )[17] .

لە سونەی عبدالله هاتووە (113/1) لە عبدالله کوڕی ادریسە پرسیاری لێکرا : ئایا نوێژ لەدوای جەهمیەکان دەکرێت ؟ فەرمووی : ( ئایا ئەوانە موسڵمانن ؟! ، نەخێر هیچ ڕێزێکیان بۆ نییە **نوێژ ناکرێت لەدوایان** ) .

(17) المغني: (438) .

وە وەکیع فەرموویەتی : ( نوێژ لەدوای جەهمیەکان ناکرێت )[18] .

وە لە الإبانة الكبرى دا هاتووە (184/1) کە پرسیارکراوە لەئیمامی مالکی کوڕی انس سەبارەت بە نوێژکردن لەدوای کەسی جەهمی ، فەرمووی : نــوێژی لەدوا مەکە ، پرســیارکەر گــوتی : تــاوەك نــوێژی جــومعەش ؟ فەرمووی : تاوەك نوێژی جومعەش وای دەبینم ئەگەر لەنەفسی خۆت لێی بترسیت ، نوێژی لەگەڵ بکە و دواتر نوێژەکەت دووبارە بکەوە .

وە یحیی ی کوڕی معین نوێژەکانی دووبارە دەکردەوە دوای ئەوەی کە مەئمون ئەو بەڵاو کوفریاتانەی بەرپاکرد ( کوفری خەلقی قورئان )[19] .

وە ئەبــو یوســف قاضــي فەرمــوویەتی : ( نــوێژ نــاکەم لەدوای کەســی جەهمی و رافضي و قەدەری )[20] .

وە ابو یعلی هێناویەتیەوە لە ئیمامی أحمدەوە سەبارەت بۆ نوێژ کردن لەدوای بیدعەچیان ، فەرمووی: بەڵام جەهمیەکان نەخێر و ڕافضەکان کە فەرموودە ڕەت دەکەنەوە نەخێر )[21] .

---

(18) السنة لعبدالله : (115/1) .

(19) السنة لعبدلله : (130/1) .

(20) شرح اصول أعتقاد : (733/2) .

(21) طبقات الحنابلة : (168/1) .

وە پرسیاری لێکراوە سەبارەت بە نوێژکردنی جومعە لە دوای ئیمامی جەهمی ، فەرمووی : ( من دووبارەی دەکەمەوە ، تۆش هەرکاتێك نوێژت لەدوای کەسی وا کرد کە بلێت قورئان مەخلوقە **نوێژەکەت دووبارە بکەوە** )[22] .

ئەمە بە پوختی چەند وتەیەکی سەلەف لەسەر نوێژنەکردن لەدوای کەسی جەهمی و هەرکاتێك کەسێك نوێژ بکات لەدوایان ئەوا دەبێت نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە .

وە گومانێك هەیە لێرەدا کە کاڵفام و ئەهلی ئیرجاء و شوێنکەوتوانی جەهمی کوڕی سەفوان دروستیان کردووە ئەویش ئەوەیە کە سەلەف دەفەرموون نوێژ لەدوای جەهمیەکان نەکەن ، مەرج نییە کە پێیان کافر بن ! .

سبحان الله نازانن لەچ ڕوویەکەوە و بە چ شێوەیەك مەنهەجە جەهمیەتە بۆگەنەکەیان سەرخەن هەر ڕۆژەی لەسەر پەتێك و گومانێك بۆ بردنی بەندەکانی الله بۆ نێو چاڵی دۆزەخ و بەردەوام خەریکی وروژاندنی گومانن .

(22) مسائل أبو داود : (43) .

وە وەڵامیش بۆ ئەوە ئەوەیە کە ئەو قسەیەیان باطلە و بێ بنەمایە چونکە لەسەر دروست نوێژ تەنها لەدوای کافر و موشریك ناکرێت و بەهەمان شێوە سەدان ئاسار هاتوون لەسەلەفەوە لەسەر بێ بنەمایی قسەکەیان .

ئەمەش چەند ئاسارێکی سەلەف سەبارت بە بێ بنەمای قسەکەیان :
پرسیارکرا لەسلامی کوڕی مطیع سەبارەت بە جەهمیەکان ؟ فەرمووی : ( **کافرن** ، نوێژیان لەدوا ناکرێت )[23] .

وە فاطری کوڕی حماد فەرموویەتی : ( پرسیارم کرد لە معتمری کوڕی سلیمان گوتم : ئەی باوکی محمد ئیمامی قەومێك هەیە دەڵێت : قورئان مەخلوقە ، ئایا نوێژی لەدوا بکەم ؟ فەرمووی : **پێویستە لە گەردنی بدەیت** ، وە فەرمووی : پرسیارم کرد لە حمادی کوڕی زید گوتم: ئەی باوکی ئیسماعیل ئیمامێکمان هەیە دەڵێت : قورئان مەخلوقە ئایا نوێژی لە دوا بکەن ؟ فەرمووی : نوێژ لەدوای موسڵمانێك بکە خۆشەویستترە لام )[24] .

---

(23) السنة لعبدالله : (105/1) .

(24) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

وە فەرمـوویەتی : ( پرسـیارم کـرد لە یەزیـدی کـوڕی زریـع گـوتم : ئەی بـاوکی معـاویە ئیمامێکمـان هەیە دەڵێت قـورئان مەخلـوقە ئایا نـوێژی لەدوا بکەم ؟ فەرمووی : نەخێر ، هیچ ڕێزێکی بۆ نییە )[25] .

ئایـا حمـاد فەرمـووی نـوێژی لەدوا مەکە و کـافری مەکە چـونکە اقـامە حجە نەکراوە ؟ ئەی کوا اقامە حجە ؟.!

وە أحمدی کوڕی عبداللە ی کوڕی یونس فەرموویەتی : ( نوێژ ناکرێت لەدوای ئەو کەسەی بلێت قورئان مەخلوقە ، **ئەوانە کافرن** )[26] .

وە محمدی کوڕی یوسف بن طباع فەرموویەتی : ( گوێم لە پیاوێك بوو پرسیاری کرد لە ئیمامی أحمد ، فەرمووی : ئەی باوکی عبداللە ئایا نوێژ بکەم لەدوای کەسێك کە بێهۆشکەر دەخواتەوە ؟ فەرمووی : نەخێر ، فەرمـووی : ئەی نـوێژ لەدوای ئەو کەسـە بـکەم کە دەڵێـت قـورئان مەخلـوقە ؟ فەرمووی : سبحان اللە ڕێگریـت لـێ دەکەم لە نـوێژ کـردن لەدوای موسـڵمان کەچـی پرسـیاری نـوێژکردنم لەدوای **کـافر** لێدەکەیت ! )[27] .

(25) السنة لعبدالله : (42) .
(26) ابو داود ڕیوایەتی کردووە : (268) .
(27) الشريعة للآجري : (81) .

وە ابو جعفر سویدی فەرموویەتی : گوێم لە وەکیع بوو پێی گوترا : فلانە کەس دەلێت قورئان داهێنراوە ، فەرمووی : ( سبحان الله ئەوە **کافر بوو** )[28] .

وەکیع رحمە الله تەنها بە گوێ لێبوون بەوەی فلانە کەس کە موعەینە کافری کرد و ئاوڕی نەدایەوە لەوەی جاهیلە یان متەئەویلە یان لاساییکەرەوەیە...یان یان .... دەیلێین و دووبارەی دەکەینەوە کوا اقامە حجە ؟ .

وە عبدالرحمنی کوڕی مهدی فەرموویەتی : ( ئەگەر دەسەلاتم هەبوایە ئەوا لەسەر جسرەکە دەوەستام هەرکاتێك کەسێك بەلامدا تێپەڕ بوایە ئەو پرسیارەی قورئانم لێدەکرد جا ئەگەر بیگوتبایە مەخلوقە **لەملیم دەدا و سەریم فڕێ ئەدایە ناو ئاوەکەوە** )[29] .

ئایا ئیمام بۆچی بەتەنها گوتنی قورئان مخلوقە حوکمی کوشتنی بەسەردا دان وەك خۆی فەرمووی ئەگەر دەسەلاتی هەبوایە ؟! وا دەزانن سەلەف لە اقامە حجە تێنەگەشتوون و ئێوە تێی دەگەن !؟ وەیل بۆتان ئەگەر ئەو بیروباوەڕەتان هەبێت .

(28) السنة لعبدالله : (33) .

(29) السنة لعبدالله : (46/206) والشريعة للآجري : (80) .

## پرسی سێیەم

## چەند نموونەیەك لە تەكفیركردنی ئیمام أحمد بۆ کەسانی معینی جەهمیەکان (دیاریکراوی جەهمییەکان) لە زاناکان

لێرەدا چەند نمونەیەك دەهێنینەوە لەو ئاسارانەی کە هاتوون لەسەر تەكفیركردنی معینی جەهمیەکان لەلایەن ئیمامی أحمدەوە :

1_ **أحمد بن ابي داود** دادوەری دەوڵەت بوو لەو کاتەدا
کاتێك کە پرسیاریان کرد لە ئیمام دەربارەی ابن ابی داود ، فەرمووی : ( **کافرە** بە خوای باڵادەست الله گۆڕەکەی پڕ بکات لە ئاگر )[30] .

وە قوتابی ئیمام اسحاق بن ابراهیم فەرموویەتی : ( جەژن هات و لەگەڵ باوکی عبدالله بووم لەو کاتەدا چیرۆك بێژێك دەیفەرموو : **کافرە** بە الله تعالى الله گۆڕەکەی ابن ابی داود پڕ بکات لە هەزار عامود لە ئاگر ، وە نەفرەتی لێدەکرد ، لەو کاتەدا باوکی عبدالله فەرمووی : **چەند بەسودن بۆ خەڵکی** )[31] ، وە لە مەسائیلی اسحاق بە بەرزترین سەنەد هاتووە .

(30) السنة لخلال : (5/118-117) .

(31) السنة لخلال : (1760) .

2_ **عبدالرحمن الشافعي** یەکێك لە قوتابیەکانی ابن ابي داود

خلال فەرموویەتی : ( زکریای کوڕی فرج پێی ڕاگەیاندم ، لە أحمد بن قاسمەوە ، کە بە ابی عبداللە شافعی گوتووە : قسەی لەگەڵت کرد ، واتە : بە ئامادەبوونی معتصم ؟ فەرمووی : **اللە سەر شۆڕی بکات ، لەسەر ئیسلامی نا بینم** )[32] .

3_ **بشر المریسي** سەرگەورەی جەهمەکان لەو سەردەمە

ئیمام لەدوای مردنی بەشری مریسی پێی فەرموو : ( **اللە گۆڕی مەریسی پڕ بکات لە ئاگر** ) ، وە لەڕیوایەتەکانی تریش تەکفیری کردووە و ناوی بردووە بە جولەکە و ڕێگری کردووە لەنوێژ کردن لەدوای[33] .

4_ **حسین الکرابسي**

ابوبکر مروذي فەرموویەتی: ( بەباوکی عبداللە م گوت : کە کرابسی دەڵێت : ئەوەی نەڵێت لەفزمان بۆ قورئان مخلوقە ئەوا کافرە ؟ باوکی عبداللە فەرمووی : **بەڵکو خۆی کافرە** ، وە فەرمووی : بەشری مریسی مرد و حسین کرابسی شوێنی گرتەوە )[34] .

(32) السنة لخلال : (1767) .

(33) سەیری السنة لخلال : (5/105-102) بکە .

(34) الإبانة الکبری : (151) و جگە لەویش .

لێرەدا ئیمام تەکفیری کرابسی کرد بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئایا کرابسی عوزری هەیە جاهلە یاخود متەئەویلە و بۆی ڕوونکراوەتەوە یاخود نا ، بەڵکو کافری کرد تەنها بە گوێ بیستبوونی کوفرەکەی .

وە کرابسی ئەو کەسەیە کە ذهبي لە (سیر أعلام النبلاء) دا لەبارەیەوە گوتویەتی: عەلامە و شارەزای بەغداد باوکی علی...... و خاوەنی ئەو نوسینانە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمام ئاوڕی نەداوەتەوە بۆ نوسراو و دانراوەکانی نە بۆ ئەوەش کە زانایە و هەڵەی کردووە یاخود متەئویلە ، نەخێر بەڵکو تەنها بە گوێبیستبوونی ئەوەی کە کوفری کردووە کافری کردووە .

**5_ أحمد الشراك**

ئیمام أحمد فەرموویەتی : ( نامەم بۆ هات لە طرسوسەوە کە أحمد شراك بانگەشەی ئەوە دەکات کە قورئان وتەی الله یە جا گەر دەرم بڕی ئەوا لەفزەکەم بۆ قورئان مەخلوقە ، فەرمووی : **الله کوشتاری بکات** ئەوە ڕێك قسەی جەهمە ) .

وە پێی گوتووە : گەڕاوەتەوە سەر ئەصلی جەهمیەت کاتێك کەوا **کافربوو** و جەهمیەتی بەدیار خست )[35] .

(35) السنة لخلال : (7/71-70) .

ئیمامی أحمد کافری کرد تەنها بەگەیشتنی نوسراوێك بۆی لەکەسانی جێگای متمانە و لە طرسوسەوە بەبێ ئەوەی حوجەی لەسەر بکات و بزانێت ئایا متەئەویلە یان جاهیلە یان.......هتد .

6_ **ئیمام نوعەیمی کوڕی حماد** رحمە اللە تعالی

خلال فەرموویەتی : ( گوێم لە ابو بکر مروذی بوو دەیفەرموو : لە شەوێکی تاریکدا هاتم بۆ لای ئیمامی أحمد ،پێی گوتم : ئەی ابو بکر ، پێم گەشتووە کە نعیم دەی گوت : خوێندنەوەی ئێمە بۆ قورئان مخلوقە ، **جا ئەگەر وای گوتبێت ئەوا اللە لە گۆڕەکەیدا لێی خۆش نەبێت** )[36] .

پاك و بێگەردی بۆ اللە نوعەیمی کوڕی حماد خاوەنی ئەو ڕێز و مەنهەجە سەلیمە لەبەتوانایی و بەرگری کردنی لە سوننەت و بەرەنگاربوونەوەی جەهمیەکان لەگەڵ ئەوەشدا تەنها بەگەیشتن بە ئیمام أحمد بەوەی ئەو قسەیەی جەهمیەکانی کردووە ئیمام أحمد دوعای لێکرد بەوەی اللە لەگۆڕەکەیدا لێی خۆش نەبێت بەبێ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات و دڵنیاببێتەوە کە ئایا قسەی وای کردووە یاخود نا و حوجەی لەسەر بکات لەسەر ئەو ئیمامە سونیە چاکەیە ؟! .

(36) السنة لخلال : (7/72) .

لەگەڵ ئەوەشدا شوێنکەوتوانی جەهم دەڵێن ئیمام تەکفیری کەسی معینی نەکردووە .

وە دەڵێن ئیمام أحمد تەکفیری خەلیفە معتصمی نەکردووە بەڵکو بە وەلی ئەمریشی زانیوون و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون ! .

پشتیوان بە الله هۆکاری داوای لیخۆشبوون کردنەکەی ئیمام أحمد بۆ معتصم لەباسەکانی دواتردا ڕوون دەکەینەوە .

**7ــ داود بن علي الظاهري** دامەزرێنەری مەزهەبی ظاهري

ابــن تیمــیە چیــرۆکەکەی لەســونەی خــلالەوە نەقــڵ دەکــات ، دەفەرمووێت : ( خلال فەرموویەتی : گوێم لە عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمـد بـوو باسـی قسـەکانی بـاوکی ( أحمـد ) ی دەکـرد لەســەر داود الأصبهاني وە نوسـراوەکەی کە بـۆی هـاتووە لەلایەن محمد بـن یحیـی النیسـابوریەوە ، فەرمـووی : داود هـاتە لام گـوتی : دەچیـتە لای ئیمـام أحمد و باسەکەی منی بۆ بکەیت کە ئەو قسانەی کراوە لەسەر من نەم گوتووە و لەمنەوە نەبووە ، فەرمووی : چوومە لای باوکم ئەو قسانەی داودم بۆ باسکرد ، فەرمووی: نەمزانی کە لێرە بێت ، وە پێی گوتم : درۆ دەکـات نوسـراوەکەی محمـد بـن یحیـی م پێگەشـتووە ، ئەو خشـتەی کتێبانـام بۆ بێنە ، خلال فەرمووی : باسی قسەکانی نـاو نوسراوەکەی کرد بەڵام باش لەبیرم نییە .

وە فەرموویەتی : باوکی یحیى پێی ڕاگەیاندم لە زکریا بن فرج ڕازیەوە ، فەرمووی : ڕۆژێك هاتم بۆ لای ابوبکر مروذی بینیم عبدالله کوڕی ئیمام أحمد لایەتی ، مروذی پێی گوت : حەزدەکەم ئەوەی لە باوکتەوە سەبارەت بە داود الأصبهانیەوە گوێت لێ بووە بە ابو یحیى ی ڕابگەیێنیت ، عبدالله فەرمووی : کاتێك کە داود هاتە خراسان هاتە لام سەلامی کرد و سەلامم لێی کرد ، گوتی : زانیم ڕادەی خۆشەویستیم بۆ ئێوە و بۆ شێخ چەندە و هەندێك قسەی لەسەر من پێگەشتووە ، وە حەزدەکەم داوای لێبوردنم بۆ بکەیت لای و بڵێیت کە ئەو قسانە قسەی من نییە ، یاخود بەو شێوەیە نییە کە پێت گوتراوە ، گوتم نایەیتە لای باوکم؟ دوای چوومە لای باوکم و پێیم گوت : کە داود هاتووە و گوتی : کە ئەو قسانەی لەنوسراوەکەدا هەیە ئەو نەیکردووە و نایکات و نکۆڵی لێکرد لەوەی ئەو قسەیەی کردبێت ، باوکم فەرمووی: ئەو خشتەی کتێبانەم بۆ بێنە و نوسراوێکی تێدا دەرهێنا و فەرمووی : ئەوە نوسراوی محمد بن یحیى النیسابوریە و ئەوەی تێدایە کە داود الأصبهاني بەڵام موسیبەتی لە شارەکەمان بڵاو کردووەتەوە و باسی ئەوەی کردووە کە داود گوتوویەتی قورئان داهێنراوە ، بەباوکم گوت : بەڵام ئەو نکۆڵی دەکات لەوە ، فەرمووی: **محمد بن یحیى لەو**

**ڕاستگۆترە ، قسەی دوژمنی الله وەرناگرین** ، یاخود ئەوەی فەرموویەتی: ابو بکر مروذی بەهەمان شێوە پێی راگەیاندم .
وە خلال فەرموویەتی : حسینی کوڕی عبدالله پێی ڕاگەیاندم ( واتە الخرقی باوکی ابو قاسم خاوەنی المختصر ) فەرمووی : پرسیارم کرد لە ابو بکر مروذي سەبارەت بەڕووداوەکەی داود الأصبهاني و باوکی عبدالله چۆن نکۆلی لێکردووە ، فەرمووی: داود دەرچوبوو بۆ خوراسان بۆ لای اسحاق ابن راهویە و چەند قسەیەکی کردبوو و هەریەکە لە نصر بن عبدالمجید وچەند شێخیك لە ئەهلی علم و حەدیس شایەدی قسەکەیان دابوو ، شایەدی ئەوەیان دابوو کە داود قسەی قورئان داهێنراوی کردووە ، جا باوکی عبدالله پێی گوتم : لە داود بن علي الأصبهانیەوە **الله هیچ شتێکی بۆ ئاسان نەکات**......)[37] .

ئەو ڕووداوەش بە ڕووداوەکەی کرابیسی و غەیری ئەو دەچێت بەتەنها بەگەیشتنی نوسراوێك لە کەسانی جێگای متمانەوە ئیمام أحمد داود الظاهري کافرکرد و نەی ویست گوێی لە عوزرەکەی ببێت وە نکۆڵی کردنەکەی ڕەت کردەوە فەزڵەن لەوەی اقامە حجەی بکات ؟ سەبارەت بە چ اقامە حجەیەك قسەیەك دەکەین لەکاتێکدا ئەسڵەن ئیمام نەی

(37) مجموع الفتاوى: (60/61) والفتاوى الكبرى : (6/394) .

ویست قسەی لەگەڵ بکات !؟ وە داود ئەو کەسەیە کە ذهبي لە (سير أعلام النبلاء) دا لەبارەیەوە گوتویەتی : ( ئیمام ، بەحر ، حافظ ، عەلامە زانای سەردەمی خۆی ) ئیمام أحمد لەگەڵ ئەوەشدا ئاوڕی لەو هەموو شتانە نەداوەتەوە و کافری کردووە و دوعای لێکردووە و پشتی کردووە لەوەی قسە و گفتوگۆی لەگەڵ بکات ، ئەی چۆن داوای لێخۆشبوون بۆ جەهمیەکی تەواو دەکات !؟.

## 8_ هشام بن عمار

ئیمام ابو بكر المروذي لە کتێبیەکەیدا ( القصص ) فەرموویەتی : (نوسراوێك لە دیمەشقەوە هات تیایدا نوسرابوو پرسیارمان بۆ بکە لەباوکی عبدالله چونکە هشام بن عمار گوتویەتی : لەفزی جوبریل و محمد ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ قورئان مخلوقە ، منیش پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله ، ئەویش فەرمووی : دەیناسم کەسێکی دوودڵ و گوماناویە ، **الله کوشتاری بکات** ، کرابیسی نەیوێرا باسی جوبریل و محمد بکات ، **هشام بووەتە جەهمی** ، وە لە نوسراوەکەشدا هاتووە کە لە وتارەکەیدا گوتوویەتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خۆی بە بەدروستکراوەکانی دەرخستووە بۆ دروستکراوەکانی ، جا پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله ، فەرمووی : ئەوە **جەهمیە** ، الله خۆی بۆ کێوەکە دەرخست ، کەچی ئەوە دەڵێت بە خۆی بەدروستکراوەکانی

دەرخستووە بۆ دروستکراوەکانی ، ئەگەر **نوێژیان لەدوا کرد با نوێژەکەیان دووبارە بکەنەوە )**[38] .

وە هشام بن عمار ئەو کەسەیە کە ذهبي لە (سير أعلام النبلاء) دا لەبارەیەوە گوتویەتی : ( ئیمامی حافظ عەلامەی خوێندەوار ، زانای شام ) .

وە هشام لە دیمەشقە و ئیمام أحمدیش لەبەغداد باشە کوا اقامە حوجە و بە اعتبار گرتنی تەئویلی و هەڵەکردنی !؟.

ئەمەش چەند نموونە و ئاسارێکی پوخت سەبارەت بە تەکفیرکردنی ئیمام أحمد بۆ ئەو کەسانەی کە دەربڕینی جەهمیەکانیان دەربڕیوە و لەسەر قورئان و هاوشێوەی قسەکانیان ، وە ئیمام کافریانی کرد و دوعای لێکردن و ئاوڕی نەدایەوە بۆ چاکەکانیان و نە بۆ ئەوەش کە خزمەتی ئیسلامیان کردووە و نە بۆ ئەوەش کە هەڵەیان کردووە یان تەئویلیان هەبوبێت و نە بۆ چاکەیان لە عیبادەتدا و نە بۆ ئەوەش ئایا اقامە حجەیان لەسەر کراوە یاخود نا ، ئەی چۆن دەگوترێت کە ئیمام أحمد تەکفیری معینی جەهمیەکانی نەکردووە و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون ! .

(38) ميزان الأعتدال : (7/87) .

## پرسی چوارەم
## چەند نمونەیەك لە تەكفیركردنی ئیمام أحمد بۆ كەسانی معینی جەهمیەكان لە كاربەدەستانی دەولەت

1ـ صالحی كوڕی ئیمام أحمد وەسفی حاڵی ئیمام أحمد دەكات لە بەندینخانەی معتصم : ( باوكم فەرموویەتی : كاتێك كە ڕۆژی سێیەم بوو یەكێك لەپیاوەكان هاتە لام و گفتوگۆی لەگەڵ كردم ، پێیم گوت : چی دەڵێی سەبارەت بە زانستی الله ؟ گوتی : مەخلوقە ، منیش پێیم گوت : **ئەی كافر كوفرت كرد** ، وە ئەو پەیامنێرەی كە ئامادەبوو لەلایەن اسحاق بن ابراهیمەوە گوتی : ئەو نێردراوە ئەمیری بڕوادارانە ، ئیمام فەرمووی : **ئەوە كافر بوو** )[39] .

2ـ ئیمام عبدالغني المقدسي لە أحمد بن غسانەوە نەقڵی دەكات كە وەسفی ڕێگاكەیان دەكات بەرەو لای مەئمون ، فەرمووی : ( رجاء الحضاري هاتە لامان گوتی : ئەو خراپانە ، ئیمام أحمد فەرمووی : **ئەی دوژمنی الله** ، تۆ دەڵێی قورئان مەخلوقە ، كەچی ئێمە دەبینە خراپ ؟ ؟ )[40] .

(39) سيرة الإمام أحمد لصالح : (52) و تاريخ الإسلام : (4/372) .
(40) المحنة لعبدالغني : (37) .

وە رجاء الحضاري وەلی و فەرماندەی سوپای گەورە بوو لە دەولەتی جەهمیەکان وەك لە کتێبی تاریخ دا هاتووە .
وە لەو قسەیەشی پەشیمان بووەتەوە سوپاس بۆ الله .

3ـــ خلال فەرموویەتی : ( حرب بن اسماعیل کرمانی پێی ڕاگەیاندم ، فەرمووی : گوێم لە أحمد بوو باسی شعیب بن سهل دادوەری بغداد کرا ، أحمد فەرمووی : **الله ڕووی ڕەش بکات** )[41] .

4ـــ میمونی فەرموویەتی : باوکی عبدالله باسی ابن رباح و شعبویەی کرد و دوعایێکی وای لێکردن کە هەرگیز نەم بینیوە بەو شێوەیە دوعا لەکەس بکات ، باسی ابو عبدالله بن رباحی کرد و فەرمووی : ( **ئەو پیسە** )[42] .

وە ابن رباح و شعبویە دوو دادوەر بوون لە دەولەتی جەهمیەت ، جا ئەگەر گوترا ئەو ئاسارانە تەکفیرکردنی تێدا نییە ، دەڵێین : ئەگەر ئیمام أحمد ولایەتەکانیانی بەدروست بزانیبوایە ئەوا بەو شێوەیە دوعای لێنەدەکردن و بەو شێوەیە قسەی پێ نەدەگوتن .

(41) السنة لخلال : (1764) .
(42) السنة لخلال : (1763) .

**5_ ابن طراح**

میمـونی فەرمـوویەتی : ( بە أحمـدی کـوڕی حنـبلم گـوت : ئەی بـاوکی عبدالله کاتێك کە جەنازەی ابن طراحی جەهمی بەڕێکەوت ، منداڵان دەستیان کرد بە هاوار کردن دەیان گوت : **بە خاوەنی ئاگری جەهەنەم بلێن داری چاك هاتووە بۆ ئاگر** ، جا باوکی عبدالله فەرمووی : با هاوار بکەن با هاوار بکەن )[43] .

**6_ أحمد بن ابي داود** دادوەری دادوەران لەدەوڵەتی ئەوکاتدا .

کاتێك کە پرسیاریان کرد لە ئیمام دەربارەی ابن ابی داود ، فەرمووی : ( **کافرە بە خوای باڵا دەست الله گۆڕەکەی پڕ بکات لە ئاگر** )[44] .

(43) السنة لخلال : (1768) .

(44) السنة لخلال : (117-5/118) .

## پرسی پێنجەم

## ئەوەی هاتووە لە ئیمامەوە سەبارەت بە هەڵوێستی لەسەر هەرسێ خەلیفەکە

خەلیفەکانی سەردەمی ئەویش ئەوانەن :

1_ **مأمون بن هارون رشید** (218-198) هەر ئەویش ئەو بانگەوازەی جەهمیەتی دامەزراند و بیروباوەڕی وەك جەهمیەکان بوو و فەرمانی دەکرد بە بڵاوکردنەوەی و تاقی کردنەوەی زانایان و دادوەران .

وە ئیمام دەستگیرکرا لەساڵی( 218 هـ ) و فەرمان کرا بە گواستنەوەی بۆ لای مەئمون و ئیمام هەر لەڕێگابوو مەئمون مرد .

2_ **معتصم بن هارون الرشید** (227-218) و ئەو ئیمامی أحمدی تاقی کردەوە و فەرمانی کرد بە لێدانی ، وە پیاوێکی شەڕکەربوو و زۆر قسەی نەدەزانی و دەیویست بەڵایەکە لابەرێت بەڵام ابن ابی داود و هاوەڵانی پاڵیان پێوە نا بۆ بەردەوامبوونی ، وە دوای تاقیکردنەوەی ئیمام تەوبەی کرد و بەڵایەکەی لابرد وەك باسکردنی دێت بە ویستی الله .

3_ **واثق بن معتصم** (232-227) زۆر شارەزا بوو لەقسەکردندا و دەمارگیربوو لەجەهمیەتدا و دووبارە بەلا و محنەی دروستکردەوە و

زانایـانی ئوممەتـی کوشـت لەوانەی کە دەسـتیان بەدیـنەوە گرتبـوو و دژایەتی جەهمیەکانیان دەکرد .

دوای ئەوانە عادل متوکل بن المعتصم دەسەڵاتی گرتە دەست (246-232) و بەڵا و محنەی بە تەواوی لابرد و فەرمانی کرد بەبڵاوکردنەوەی سوننەت و لەناوبردنی بیدعە ڕەحمەتی فراوانی الله لەسەری بێت .
لێرەدا بە شـێوەیەکی فـراوان باسـی هەر خەلـیفەیەك لە خەلیفەکـان و هەڵویستی ئیمام أحمد بەرامبەریان دەکەین :

## 1ـــ مەئمون

بەڵگەی ڕوون هاتووە لەئیمامی أحمدەوە لەسەر تەکفیرکردنی مەئمون وە دوعا لێکردنی و قسە پێ گوتنی :
1ـــ خـلال فەرمـوویەتی : ( أحمـد بـن محمـد بـن مطـر هەواڵـی پێـدام ، گوتی : ابو طالب بۆی باسکردین ، فەرمووی : گوتم بە باوکی عبدالله : کە بەڵای گۆڕێکدا تێپەڕین لەطرسوس ، جا خەڵکی طرسوس گوتیان : **کافرەکە ، الله ڕەحمی پێ نەکات** ، جا باوکی عبدالله فەرمووی : **بەڵێ ، الله ڕەحمی پێنەکات ئەو ئەوەی دروست کرد و دایهێنا** )[45] .

(45) السنة : (1708) .

وە زانراویشـە لە مەئمـون تـاقیکردنەوەکەی داهێنـا و لە طرسـوس نێـژرا وەك مێژوونوسـان باسیان کردووە لەوانە ذهبي لە باسکردنی مەئمون لە ( سیر أعلام النبلاء ) دا .

2ــ ئیمام أحمد لەڕێگادا دوعای لێدەکرد و دەیفەرموو : ( گەورەم ئەو **فـاجرە فێڵـی لە دیـنەکەت کـرد** ، تـاوەك دەسـتی گەشـت بەوەی لە دۆستانت بدات و بیانکوژێت ، یا الله جا ئەگەر قورئان قسەی تۆیە و مەخلوق نییە ، ئەوا **لەكۆڵمانی بکەیتەوە** )[46] .

3ــ عبـدالغنی گیـڕاویەتیەوە لە القـواریریەوە هـاوەڵی ئیمـام أحمـد لە لەکـاتی بەڕێگـادا بـوون بـۆ لای مەئمـون فەرمـوویەتی : ( کاتێـك کە ئێمەیان برد بۆ لای مەئمون بۆ وڵاتی ڕۆم لە ڕۆژانی میحنەدا ، ڕۆیشتین تـاوەك نزیـك بـوینەوە لە ڕەقە لە شـەوێکی مـانگە شـەویدا ، منـیش گەنجێـك بـووم لە گـوێزەرەوەکەم ئەدا ، وە ئاوڕم دایەوە و گـوتم : چـی لەدواتەوەیە ؟ گوتی : مژدە بدە بە أحمد کە مەئمون لەو کاتەدا مرد ، قواریری فەرمووی : منیش سەیرم أحمدم کرد دەستی بەرزکردۆتەوە و **دوعـا دەکـات ، هـیچ گومانمـان لەوە نەبـوو کە دوعـای لێکـردووە و دوعاکەی قبوڵ بووە** )[47] .

(46) المحنة لعبدالغني : (58) والبداية والنهاية : (10/366) .

(47) المحنة لعبدالغني : (62) .

4_ قاضي أبو يعلى لە الاحكام السلطانية لاپەڕە (21) دا فەرموویەتی : ( لەسەر ڕووی یەکێك لە کتێبەکانی براکەم بینیم : ابو الفتح بن منيع فەرموویەتی : گوێم لە باپیرم بوو دەیفەرموو : ئیمامی أحمد هەرکاتێك باسی مەئمونی بکردبایە دەیگوت : **بەڕاستی مەئمون نەبوو** ) .

وە قاضي لە بارەی ئەو ئەسەرەدا فەرموویەتی : ( ئەو قسەیەش مانای **زەم کردن و تانە لێدانە لێیان** ، وە ئەوەش یەك مانا ئەدات ئەویش ئەوەیە کە **تانەی لە ویلایەتەکەیان داوە** ) .

ئەوەش ئەوە بوو کە لە ئیمامی أحمدەوە هاتووە سەبارەت بە مەئمون لە کافرکردنی و دوعا لێکردنی و بەخراپ باس کردنی .

## 2_ الواثق

سەبارەت بە واثق ئەوا ئیمامی أحمد ناوی بردووە بە دوژمنی الله و دوژمنی ئیسلام وە مەدحی أحمد بن نصر الخزاعيشی کردووە کە واثقی کافرکرد و دەرچوو لێی لەگەڵ ڕازی موافەقە نەکردنی ئیمام بۆی لە دەرچوونەکەیدا لە واثق .

1_ حنبل بن اسحاق نەقڵی کردووە لە ئیمامەوە کە دەربارەی واثق فەرموویەتی : ( چ بەڵایەك لەوە گەورەتربوو لەو کە **دوژمنی الله و دوژمنی ئیسلام هێنای بەسەر ئیسلامدا لە لەناوبردنی سوننەت** ،

ئەوەی پێش متوکل ، دواتر متوکل سونەتی زیندوو کردەوە ، رەزای الله لەسەری بێت )[48] .

ئیمام یوسف بن عبدالهادی الحنبلي فەرموویەتی : ( ئیمام أحمد بە **دوژمنی الله** و **دوژمنی ئیسلام** قسەی لەبارەوە کردووە ، **جا ئەگەر لەلای ئیمام و موسڵمان بوایە ئەوا ئەو قسانەی لەسەر نەدەکرد** )[49] .

2_ وە کاتێك ئیمام أحمد بن نصر الخزاعي واثقی کافر کرد وە لێی دەرچوو واثق گرتی و کوشتی ، ئیمامی أحمد مەدحی دەکرد و دەی فەرموو : ( **رەحمەتی الله لەسەری چەند سەخی بوو بۆ الله ، نەفسی خۆی بەخشی لە پێناو الله** )[50] .

لەگەڵ ئەوەش کە ئیمام أحمد لەگەڵی نەبوو لە خروجکردنەکەیدا وە کاتێك زانایانی بەغداد هاتن و پرسیاری خروج کردنیان لێکرد رێگری لێکردن و فەرمانی کرد بەوەی ئارام بگرن و ئاگاداری کردنەوە لە خوێنرێژی و فتنەی گشتی چونکە دەسەڵاتدار ئەگەر کافریش بێت

(48) السنة لخلال : (1/89) و الأحكام السلطانية : (1/20) .

(49) إيضاح طرق الاستقامة : (45) .

(50) تاريخ بغداد : (5/177) والبداية والنهاية : (10/336) .

ئەوا خروج لێکردنی مەرجی زۆری هەیە لەوانە : هەبوونی توانا و هێز و ڕوونەدانی فتنە و هەبوونی جێگرەوەی.....هتد .
ئەوەش ئەوەندە بوو کە لە ئیمام أحمدەوە هاتووە سەبارەت بە واثق ، والله اعلم .

## 3_ المعتصم

سەبارەت بەمعتصم ئەوا ئیمام أحمد زۆر توندبووە بەرامبەری هەتاوەك لەکاتی گفتوگۆدا تەکفیری کردووە .
حنبل بن اسحاق فەرموویەتی : ( لەکاتی گفتوگۆی ئیمامی أحمد ئەوانەی لەگەڵ معتصم بوون لەنێوان خۆیاندا گوتیان : ئەی ئەمیری بڕواداران **ئێمە و تۆشی کافر کرد** )[51] .

معتصم پیاوێکی شەڕکەر بوو هیچی نەدەزانی لە قسە وە دەیویست میحنەکە لابیات بەڵام ابن ابی داود و هاوەڵانی پاڵیان پێوەنا بۆ بەردەوام بوون .

صالحی کوڕی ئیمام أحمد فەرموویەتی : ( معتصم پێی گوت : ئەی باوکی عبدالرحمن ئایا فەرمانم پێ نەکردی بۆ ئەوەی میحنەکە

(51) المحنة : (45) .

لابیەیــت ، جــا بــاوکم فەرمــووی : الله اکبــر ئەوە دڵخۆشــیە بــۆ موسڵمانان )[52] .

بەڵام زۆریان لێکرد و ناچاریان کرد کە بەردەوام بێت تاوەك گەیشت بەوەی زۆر خراپ لە ئیمام أحمد بدات و ئازاری بدات! .

جا کاتێك کە بینی چی بەسەر ئیمام أحمد دا هات لەدوای لێدانی و هێز و پێداگری ئیمام و بەڵگەکانی بینی تەوبەی کرد و **پەشیمانبویەوە** و میحنە و بەڵا و بانگەوازی جەهمیەتی لابرد وە کاتێك ئیمام أحمد ئازادبوو وای لێهات کە بە ئازادی دەجولایەوە و دانیشتنی حدیس و فەتوادانی هەبوو تاوەك معتصم مرد و واثق دەسەڵاتی گرتە دەست .
وە داوای لێخۆشبوون بۆ کردن و گەردەن ئازادکردنی هەر بەهۆی ئەو هۆکارە بووە .

وە هەڵوێستی ئیمام أحمد جیاواز بوو بەرامبەر بە معتصم بەبەراورد لەگەڵ جەهمیەکانی تر ئەوەش بەهۆی هۆکاری پەشیمان بوونەوەی معتصم بوو نەك هۆکاری تر .

(52) سيرة الإمام أحمد : (55) .

**ئەو بەڵگانەی کە ئەوەش دەسەلمێنن :**

حنبل بن اسحاق کە یەکێکە لەگەورە قوتابیان و هاوەڵی ئیمام أحمد و دراوسێ و نزیکی بوو ( کوڕی مامی بوو ) و لەو ساڵانەدا لەگەڵی بووە ، فەرمـوویەتی: ( وە بـاوکی اسـحاق ( واتە معتصـم ) فەرمـانی کـرد بە اسـحاق بـن ابـراهیم کە دەربـارەی ئەو هـیچ شـتێك نەپچڕێنـدرێت ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە وازی لێهێنابوو لەکاتی ناخۆشیدا ، وە پێمان گەیشـتووە کە ابـو اسـحاق **پەشـیمان بـوەتەوە** لەدوای ئەوە وە وازی هێناوە تاوەك تەواو چاك بووە )[53] .

ئەوەش بەڵگەیەکـی ڕوونە لەوەی ئیمـام أحمـد پەشـیمانبوونەوە و تەوبەی معتصـمی پـێ گەشـتووە و معتصـم سەرپەرشـتی چـارەکردنی ئیمامی لەئەستۆ گرتووە وە یارمەتی داوە و نیگەران بووە لەبارەی .

وە ابـن کثیـر فەرمـوویەتی : ( کاتێـك کە گەڕایەوە بـۆ مـاڵەوە بـرین پـێچەکە هـاتە لای و پـارچە گۆشـتێکی مـردووی لە لاشـەی بـڕی و چارەسـەری کـرد و جێگـرەوەش لەهەمـوو کاتێکـدا پرسـیاری دەکـرد لەبـارەی ، ئەوەش بەهـۆی ئەوەی کە **معتصـم زۆر پەشـیمان ببـویەوە** لەوەی بەسـەر أحمـدی هێنـابوو ، وە جێگرەوەکەی پرسیاری لەبـارەی

(53) ذكر المحنة : (61) .

دەکرد ، وە کاتێك کە ئیمام چاکبوویەوە معتصم و موسڵمانان دڵخۆش بوون بەوە ،... وە **گەردەنی هەموو ئەوانەی ئازاد کرد کە ئازاریان داوە تەنها بیدعەچیان نەبێت** ، وە لەو کاتەدا ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە : (وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا) وە دەیفەرموو : چ سودت پێ دەگات کە براکەت بەهۆی تۆوە سزا بدرێت ؟ )[54] .

وە حافظ ایو طاهر بەسەنەدەکەی دەریهێناوە کە معتصم لەخەودا دەیفەرموو : ( ئەی أحمد ، من لەتۆم بوری تۆش لێم ببورە ، ئەگەرنا جەلدە بگرە و تۆڵەی خۆتە بکەوە لێم )[55] .

وە ئەوەشی نەقڵ کردووە کە : ( کاتێك کە معتصم لە أحمدی کوڕی حنبلی دەدا هیچ ڕای لێنەبوو ، وە دەلەرزی و هەستی بەشەرمەزاری نەفس دەکرد ، وە شان و قۆلەکانی دەلەرزی و خەریك بوو پێیەکانی خۆی نەگرێت لەسەر زەوی دا ، جا ئەگەر پێیان بگوتبایە دکتۆر دەهێنین ، دەی گوت : من هۆکارەکەی دەزانم ، هۆکارەکەی تاقیکردنەوە و لێدانی **بەندەی چاکەکار أحمدی کوڕی حنبلە کاتێك کە توشیم کرد** ، تاوەك لەسەر ئەوە مرد )[56] .

(54) البداية والنهاية : (10/369) .
(55) المحنة لعبدالغني : (110) .
(56) المحنة لعبدالغني : (116-115) .

وە معتصم میحنە و بەڵاکەی لابرد و لەدوای أحمد کەسی تر تاقی نەکرایەوە و ئازاری نەدرا .

ابن جوزی گوتویەتی : ( **واثق** ئازاردان و تاقی کردنەوەی سەبارەت بە قورئان دووبارە کردوەوە )[57] .

وە ئیمامی أحمد بە ئارەزووی خۆی دەجولایەوە و دانیشتن و فەتوادانی هەبوو تاوەك خەلیفە معتصم مرد و واثق دەسەڵاتی گرتە دەست .

حنبل بن اسحاق فەرموویەتی : ( لەو کاتەی کەوا معتصم باوکی عبدالله ی ئازادکرد بەڵاو ناخۆشیەکە تەواو کۆتایی پێهات وە پارێزراوبوو لە لێدان و ئامادەی جومعە و جەماعەت دەبوو ، وە قسەی لەگەڵ هاوەڵانی دەکرد و فەتوا دەدا ، تاوەك ابو اسحاق (معتصم) مرد و هاروونی کوڕی دەسەلاتی گرتە دەست کە ناسراوە بە واثق ، ئەوەبوو کە دروستی کرد لە بەڵاو ناخۆشی و تاقی کردنەوەی زانایان و مەیل چوون بەلای أحمد بن ابی داود و هاوەڵانی )[58] .

جا هۆکاری تەوبەی معتصم و پەشیمان بوونەوەی وای لە ئیمام أحمد کرد کە گەردەنی ئازاد بکات و دوعای لێخۆشبوونی بۆ بکات بە

(57) المنتظم : (3/341) .

(58) ذكر المحنة : (69) .

پــێچەوانەی ئەوانەی کە بەردەوام بــوون لەســەر بیروباوەڕەکــانی جەهمیەت وە خۆشی ئاماژەی بەوە داوە .

حنبـل بـن اسـحاق فەرمـوویەتی : ( لای بـاوکی عبـدالله بـووم و پیاوێـك هاتە لای لە مزگەوتەکەی ئێمە ، وە پیاوێکی پلەدار بوو ، وەك ئەوەی لەگەڵ دەســەڵاتداران بێــت ، دانیشــت تـاوەك هەمـوو ئەو کەسـانە ڕۆشـتن کە لای ئیمـام أحمـد بـوون ، دواتـر چـووە پێشـیەوە و بـاوکی عبـدالله ـش قبـوڵی کـرد کاتێـك کە پلەدارییەکەی بینـی ، گـوتی : ئەی بـاوکی عبـدالله بمـکە ژێـر فراوانـی خـۆت و گەردەنـم ئازادبـکە ، ئیمـام فەرمووی : لەسەر چی ؟ گوتی : ئەو ڕۆژەی کە لێت درا و ئازاردرای من لەوێ ئامادە بووم و بێدەنگ بووم منیش ئیستا بۆ ئەوە هاتووم ، باوکی عبدالله سەری دانواند و دوای سەری بەرزکردەوە و فەرمووی : لەنێوان خـۆت و الله تعـالی تەوبە بـکە و جـارێکی تـر نەگەڕێیـتەوە سـەر ئەو هەڵوێستانە ، گوتی : ئەی باوکی عبدالله ، من تەوبەم کردووە لای الله تعالی لە دەسەڵاتدارەکان ، باوکی عبدالله فەرمووی : **کەواتە تۆ لەژێر فراوانی و گەردەن ئازادیی منیت** ، وە هەموو کەسێکیش کە باسی منی کردبێـت تەنیـا **بیـدعەچیان نەبـن** ، وە بـاوکی عبـدالله فەرمـووی : وە **گەردەنی ابو اسحاق (معتصم) یشم ئازاد کردووە** ، وە بینیم الله تعالی فەرموویەتی : ( وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ ) وە

پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی کرد بە ئەبوبەکر الله لێی ڕازی بێت کە لێبوردە بێت لەڕووداوی ( مسطح ) جا باوکی عبدالله فەرمـووی : لیبـوردن باشـترە ، چ سـودت پـێ دەگـات ئەگەر بـرای موسڵمانت بەهۆی تۆوە سزا بدرێت ، بەڵکو لێبوردە دەبیت یاخود ئاشت دەبیتەوە و الله لێت خۆشدەبێت ، وەك بەڵێنی پێت داوە )[59] .

وە لە حنبل بن اسحاقەوە بەسەنەدی خۆی فەرموویەتی : ( کاتێك کە ئامـۆزاکەم پـارچەیەك لە ئەنـدامێکی شـکا ، ئـێمەش نەمـان دەتـوانی چـارەی بکەیـن لەترسـی ئەوەی لە نـاو دەرمانەکـان شـتێکی ژەهـراوی هەبێـت ، تـاوەك وەسـفی دکتـۆرێکی چاکیـان بـۆ کـردین لە بەصـرە ، ئـێمەش هێنامـان ، جـا کە سـەیری شـوێنە شـکاوەکەی کـرد بینـی کە ئەندامەکە گرێدراوە بە گۆشتێکی مردوو ، جا دکتۆرەکە بەددانەکانی خۆی لێی کردەوە و دەترسا لێی ، جا کە لەژێر هۆشدا بوو بەزمانێکی لاوازەوە فەرمووی : خوایە لێیان نەگریت ، کاتێك کە بەخۆی هاتەوە گوتم : گوێم لەتۆ بو وا دەلێیت ، ئیمام فەرمووی : بەلێ ، حەزم کرد بگەم بە الله و لەنێوان من و نزیکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێك نەبێت ، وە گەردەنی هەموویانم ئازادکردووە ، **جگە لە ابن**

(59) ذكر المحنة : (65) .

**ابی داود و هاوشێوانی نەبێت ، من هەرگیز لێیان نابورم و گەردەنیان ئازاد ناکەم )[60] .**

هەموو ئەو بەڵگانە صحیحە ڕوونانە ڕوونە لەوەی ئیمام أحمد هەرگیز لەجەهمیەکانی نەبووریوە بەڵکو تەنها لە معتصم و هاوشێوەکانی بوریوە لەوانەی کە تەوبەیان کردووە و ئەوانەشی کە ئەو بیروباوەڕەیان نەبووە .

بەڵام ئەوەی دەلێت لە ابن ابی داودی بووریوە و گەردەنی ئازاد کردووە باطڵ و بێ بنەمایە ، هیچ بەڵگەیەك نییە چ صحیح چ لاواز چ هەڵبەستراو و پێچەوانەی ڕیوایەتەکانی تری صحیحە کە هاتووە لەبارەی ابن ابی داود و هاوەلانی لەدوای مردنی ابن ابی دواد و کافرکردنی و دوعا لێکردنی ، والله اعلم .

4_ قسەی ئیمام أحمد لەسەر لەکارکەوتنی ویلایەتی دەسەلاتدارانی جەهمیەکان لەسەردەمی خۆیدا و تانە لێدانیان .

**بۆ سەلماندنی ئەوەش چەند وتەیەکی ئیمام أحمد دەهێنینەوە:**

1_ لە ابو بکر الأعینەوە کە ئیمام آدم بن إیاس العسقلانی کاتێك کە هەواڵی بەندکردنی ئیمام أحمدی پێگەشتووە فەرموویەتی : ( ویستیان

(60) المحنة لعبدالغني : (71) .

بمانبەنە سەر کوفر بەڵام ئێمە لێیانمان بردەوە ، گوتم : چی دەلێی بەو کەسەی دەلێت : قورئان مەخلوقە ؟ فەرمووی : **کافر بووە** ، وە آدم فەرمووی : أحمد بن حنبل یان بەندکرد و گوتیان : بلێ قورئان مەخلوقە ، إنا لله وإنا إليه راجعون ، **دوژمنانی ئیسلام !** ) .

دواتر ئامۆژگاری ئیمام أحمدی کرد و داوای بەردەوامی ئارام گرتنی کرد ، وە کاتێك ئامۆژگاری و قسەکەی گەشت بەئیمام أحمد فەرمووی: ( **ڕەحمەتی الله لەکاتی ژیان و مردنی لەسەری ، ئامۆژگاری کردین و چاکترین ئامۆژگاری** )[61] .

وەك دەبینین دانی ناوە بە کافرکردنیان و هیچ تێبینی و ڕەخنەیەکی لەسەر نەبووە .

2ـ قاضي أبو يعلى فەرموویەتی: ( وە لە ڕیوایەتی الأثرم دا لەبارەی ئافرەتێك کە هیچ وەلیەکی نییە ) ئیمام أحمد فەرمووی : **دەسەڵاتدار** ، پێی گوترا : دەڵێیت دەسەڵاتدار و ئێمەش لەسەر ئەو حاڵەی ئەمڕۆین کە تۆش دەیبینیت ؟ ( لەو کاتیشدا دادوەر و زانایان تاقی دەکرانەوە لەلێدان و ئازاردان بە خەلقی قورئان ) ئیمام فەرمووی: من لەگەڵ ئەو

(61) سەیری المحنة لعبدالغني : (68-70) بکە .

دەسەڵاتدارانەی ئەوڕۆی خۆمانم نیە ، بەڵکو تەنها گوتم دەسەلاتدار دەبێتە وەلی ئافرەتەکە )[62] .

ئەو قسەیەش مانای تانە دانە لێیان و زەم کردنە بۆیان و ئەوەش تەنها بۆ ئەوەیە کە تانەی داوە لە دەسەڵاتەکەیان .

3_ ئیمام أحمد کاتێك کە هەندێك کەس بە ئامادەبوونی خۆی هاوسەنگی و بەرامبەریان کرد لەنێوان حجاج بن یوسف و ئەو جەهمیانە ، ئیمام فەرمووی: ( چ شتێك لەوانە بە حجاج دەچێت ؟ **ئەوانە ویستیان دین بگۆڕن** )[63] .

4_ ابن کثیر فەرموویەتی: ( پیاوێك نوسراوێکی نارد بۆ متوکل گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران **أحمد تانە و تەشەر لە باوکانت ئەدات و ناویان دەبات بەزەندیق** ، جا متوکل بۆی نوسیەوە: سەبارەت بە مەئمون ئەوا تێکەڵی کرد و خەڵکی لەدژایەتی خۆی کۆکردەوە ، بەڵام معتصمی باوکم پیاوێکی شەڕاوی بوو و هیچ قسەی نەدەزانی ، سەبارەت بە واثقي براشم ئەوا ئەوەی لەسەری گوتراوە شایستەیەتی ، دواتر فەرمانی کرد بە لێدانی ئەو پیاوەی کە نوسراوەکە بۆ هێنا بوو بە

(62) الأحكام السلطانية : (21) .

(63) السنة لخلال : (5/121) .

سەد جەلدە ، وە عبداللە بن اسحاق بن ابراهیم بردی و پێنج سەد جەلدەی لێدا ، جا خەلیفە پێی گوت: بۆچی پێنج سەد جەلدەت لێدا ؟ فەرمووی: دووسەد بۆ گوێڕایەلی تۆ و دوو سەد بۆ گوێڕایەلی اللە ، وە سەد جەلدەش بۆ تۆمەت هەڵبەستنی بۆ ئەو شێخە چاکەیە أحمدی کوڕی حنبل )[64] .

5_ ( کاتێك کە پسیارکرا لە ئیمامی أحمد لەوەی کەسێك سەروەتێکی هەیە داوای دەکەن بۆ میرات ، جا دەترسێت لەکارەکەی ، ئایا بەدروستی دەبینیت کە دەسەڵاتدار ئاگادار بکاتەوە و پێی بدات ؟ فەرمووی: **سەبارەت بە دەسەڵاتدارانی ئێستای ئەمڕۆ ئەوا نابینم هیچ شتێکیان پێ بدرێت** ، با هیچ شتێکی پێ نەدات )[65] .

6_ ئیمام نوێژی دووبارە دەکردەوە لەدوای پێش نوێژخوێنانی جەهمیەکان تاوەك کە متوکل دەسەلاتی گرتە دەست و بەلاو میحنەکەی لادا ، حنبل بن اسحاق فەرموویەتی: ( **نوێژەکانی دووبارە دەکردەوە** تاوەك ئەو کاتەی متوکل دەسەلاتی گرتە دەست ، وە ئەو

(64) البداية والنهاية : (10/374) .

(65) الفروع : (7/239) .

قسانەی جەهمیەکانی لابرد ، ئیدی ئیمام دوای ئەوە نوێژەکانی **دووبارە نەدەکردەوە** )[66] .

(66) ذكر المحنة : (70) .

## پرسی شەشەم

## حوکمی جەهمیەکان وەك حوکمی کافرەکانە لەهەموو حوکمەکانی دین

لەو بەڵگـانەش کە بەڵـگەیە بـۆ ئەوەی کـە ئیمـام أحمـد تەکفیـری جەهمیەکانی بە موتڵەقی و معینەوە کردووە بریتییە لەوەی کە حوکم و هەڵوێسـت بەرامـبەر جەهمیەکـان وەك حـوکمی کـافرانە لە هەمـوو حـوکمە فیقهیەکـان بەبـێ هـیچ جیـاوازی کردنێـك لەنێـوان کەسـی مـوتەئەویلی معانـد و لەنێـوان جاهـل و زانـا و لەنێـوان ئەوەی بـۆی ڕوونکراوەتەوە یاخود نا بەڵکو هیچ جیاوازی نەکردووە لەنێوانیان .

**چەند نموونەیەك لەوە :**

**1ــ ڕێگری لە میرات وەرگرتن و دان لەنێوان موسڵمان و جەهمی .**

أبو نعیم فەرموویەتی: ( ابو بکر الآجري بۆی باسکردین ، الحسن بن الحباب المقري بۆی باسکردین ، قاسم بن اسد الأصبهاني الطرسوسي بۆی باسکردین ، فەرمووی: پرسیارم کرد لە بـاوکی عبدالله أحمد بـن حنبـل ، لەسـەر ئەو کەسـەی دەڵێـت: قـورئان مەخلـوقە ، یـاخود قسـەیەك لە قسـەکانی جەهمیەکـان دەکـات ، **ئایـا میراتگـری کێـیە ؟** فەرمـووی : **سـەروەتەکەی بـۆ چەك و شـتەکانی جەنـگە بـۆ جیهـادی موسـڵمانانە ، کەس میـراتەکەی وەرناگرێـت** ، گـوتم : ئەی بـاوکی

عبدالله ، بەڵگە چیە لەوەی سەروەتی جەهمیەکان بۆ چەك و جیهادی موسڵمانانە ؟ فەرمووی: حفص بن غیاث بۆی باسکردین لە أشعثەوە ، لە حەسەنەوە دەربارەی ئەو کەسەی بمرێت و میراتگرەوەی نەبێت فەرمووی: سەروەتەکەی بۆ چەك و جیهادی موسڵمانانە ، ئەمەش بەو شێوەیەیە )[67] .

جا جەهمی حوکمی ئەوەیە کە میراتگری نییە چونکە موسڵمان نابێتە میراتگری کافر .

وە ئیمام احمد رحمە الله رەخنەی لەهیچ کەسێك نەگرتووە کە تەکفیری موعەیەنی جەهمیەکانی کردبێت بەڵکو تەکفیر کردنیان واجبە و تەکفیر نەکەری جەهمی هۆکارێکە کە لە جەماعەت دەیباتە دەر .

ئەبو هاشمی زیاد کوڕی ئەیوب فەرموویەتی:

بە ئیمامی أحمد کوڕی حنبلم گوت: ئەی باوکی عبدالله پیاوێك وتی قورئان مخلوقە ، منیش پێیم وت هەی کافر ، ئایا هیچم لەسەرە ؟

فەرمووی: عبدالرحمنی کوڕی مهدی دەی فەرموو: ئەگەر من کەسانی نزیکم هەبێت لەوانە و بمرێت ئەوا میراتەکەیم وەرنەدەگرت .

(67) أخبار الأصبهان : (49) .

پیاوە خوراسانیەکە بە فارسی پێی وت: ئەوەی بلێت قورئان مەخلوقە ئایا پێی بڵێم کافر؟

ئیمام أحمد فەرمووی: بەلێ[68] .

ئایا بۆ پێی نەگوت بۆ ئەو کەسەت کافر کرد؟

بۆ پێی نەگوت ئایا ئەو کەسە جاهیلە یان متەئەویلە یان لاسایی کەرەوەیە؟

بۆ پێی نەگوت اقامە حجەی بکە ئینجا کافری بکە؟.

بۆچی پێی نەگوت تۆ تەکفیریت و خارجیت؟ وە چۆن بەبێ اقامە حجە کافری دەکەیت؟ .

ئەوەش مەبەستی ئیمامە کە لەچەندین ریوایەتەوە فەرموویەتی: ئەوەی بڵێت قورئان مەخلوقە کافرە، ئەوەشی کافری نەکات کافرە .

ابو هاشمیش تەکفیری کردووە .

بۆیە قسەکانی ئیمام أحمد ئەگەر بە موتڵەقیش کردبێتی ئەوا لە جەندین ئەثەری تردا دانی ناوە بەتەکفیرکردنی موعەیەنیش بەبێ اقامە حجەش .

(68) السنة اللالكائي : (415) .

**2_ بەتاڵبوونەوەی نوێژ لەدوای کەسی جەهمی .**

ئەوەش لە پرسی سێیەم باسکرا ، زیاتریش دێت إن شاء الله .

**3_ بەتاڵبوونەوەی نوێژ لەدوای ڕیز لەگەڵ کەسی جەهمی .**

إبن بطة لە الإبانة الكبرى (6/122) فەرموویەتی: ابو القاسم حفص بن عمر بۆ باسکردم فەرمووی : ابو حاتم هەواڵی پێدام ، فەرمووی : عبدالعزيز بن ابی سهل المروذي پێی ڕاگەیاندم ، فەرمووی: عصام بن الحسن پێی ڕاگەیاندم ، فەرمووی: عبدالصمد بن حسان پێی ڕاگەیاندم فەرمووی: خارجة بن مصعب فەرمووی: **ئەگەر نوێژت لەدوای ئیمام کرد و جەهمیەك لەتەنیشتت بوو لەڕیزدا نوێژەکەت دووبارە بکەوە** ) .

ابن بطة فەرموویەتی: ( مانای قسەکەی خارجە سەبارەت بە جەهمیەك نوێژ بکات لە تەنیشت پیاوێکەوە دووبارەی بکاتەوە ، مەبەستی لەوەیە کە ئەوەی نوێژ بکات لەدوای ئیمام **بەتەنها و لەتەنیشتیشی جەهمیەك هەبێت** ، یاخود نوێژ بکات لەدوای ڕیزەکان بەتەنها و لە تەنیشتیشی جەهمیەك هەیە ، ئەوا **نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە** ، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە مەزهەبی کۆمەڵێك لە زانایان ، ئەوەیە کە ئەوەی بەتەنها نوێژ بکات لەدوای ڕیزەوە یاخود بەتەنها لەدوای ئیمام بیکات نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە ، چونکە خارجە مەبەستی لەوەیە کە ئەوەی نوێژ بکات لەدوای ڕیز و لەتەنیشتیشی

جەهمیەك هەبێت **وەك ئەوە وایە کە بەتەنها نوێژی کردبێت** لەدوای ڕیزەکەوە ، چونکە کەسی جەهمی لەنوێژیشدا موسڵمان نییە ، بۆیە ئەوەی لە تەنیشتیەتی وەك ئەوە وایە کە بەتەنها نوێژ بکات لەدوای ڕیزەوە ، بەڵام ئەگەر کەسی جەهمی لەڕیزێکدا بوو کۆمەلێك موسلمانی تیا بوو ئەو بەتەنها بوو ئەوا نوێژی جەماعەتەکە دروستە .

بەهەمان شێوە مروذي ڕیوایەتی کردووە: ( لە باوکی عبداللە وە فەرمووی: بە باوکی عبداللە م گوت: پیاوێك لەگەڵ پیاوێکدا لەدوای ڕیزەوە نوێژ دەکات ، کاتێك کە سەلامی دایەوە دەبینێت ئەوەی لە تەنیشتی نوێژ دەکات کەسێکی جەهمیە ، امام فەرمووی: نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە چونکە لەدوای ڕیزەوە بەتەنها نوێژی کردووە یاخود وتەکەی ئەو مانایەی هەیە بە ویستی اللە ) .

ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە ئەصڵ لەجەهمیەکان لای ئیمام أحمد ئەوەیە کە کافرێکی زەندیقن چونکە ئەو کەسەی نوێژ دەکات نازانێت ئەو جەهمیەی لەتەنیشتی نوێژ دەکات جاهلە یان موتەئەویلە کە لە نوێژدایە یاخود لەدوای نوێژ بەڵکو دەزانێت کە جەهمیە لەشتی تر ناپرسێت و نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە .

یـان ئەوەتـا دەگوترێـت پێویسـتە لەسـەر ئەو نـوێژکەرەی کە نـوێژی لەگەڵ جەهمـیەکە کـردووە لەڕیـزدا دابنیشـێت لەگەڵ جەهمـیەکە و گفتوگـۆی لەگەڵ بکـات لەدوای نـوێژدا هـەتـاوەك بزانێـت ئایـا موتەئەویل بووە یان نا وە لەوانەیە چەندین کاتژمێری لەگەڵدا بەسەر ببات و کاتی نوێژ تەواو دەبێت کەچی تاوەك ئێستا هەر لەگەڵی لە گفتوگۆیە !! ئەوەش کەسی عاقڵ نایڵێت ! یان ئەوەتا ملکەچی هەق دەبێت و دەڵێت ئیمامی أحمد نوێژەکەی بەتاڵ کردۆتەوە بەبێ ئەوەی سـەیری نـاوەوەی کەسـەکە و باسـەکە بکـات چـونکە ئەصـل لەجەهمیەکـان کـوفرە جـا کەسـی جەهمـی حـوکمی حـوکمی کـافرانە لە هەموو حوکمەکانی دین .

**4_ پوچەڵبوونەوەی حوکمدان و بڕیاری دادوەرانی جەهمیەکان** .

عبدالله بن أحمد فەرموویەتی: ( گوێم لە باوکم بوو دەیفەرموو : **ئەگەر دادوەرەکە جەهمی بوو ئەوا شایەدی لەلا مەدە** )[(69)] .

وە صالح بن أحمد فەرموویەتی: ( باوکم فەرمووی **دروست نییە پیاو شایەدی بدات لای دادوەری جەهمی** ، وە پرسیارکرا لە باوکم: پیاوێك شـایەدی داوە لای دادوەر جـا بانگیـان کـردۆتەوە بـۆ لای دادوەر ئایـا

(69) السنة لعبدالله : (1) .

بچێتەوە لای لەکاتێکدا دادوەرەکە جەهمیە ؟ فەرمووی: **ناچیتە لای** ، گوتم: ئاخر دەستدرێژی کراوەتە سەری جا ئەویش چووە و تاقیان کردۆتەوە ، فەرمووی: **وەڵامیان ناداتەوە هیچ ڕێزێکیان بۆ نییە مشتێك لە خۆڵ هەڵدەگرێت و لە ڕووخساری خۆی دەدات )**[70] .

وە ئیمام أحمد فەرموویەتی: ( **ئەگەر دادوەر جەهمی بێت ئەوا کاربەدەستی شارەکە ئافرەتەکە بەشوو دەدات )**[71] .

وە حوکمدانی ئیمام أحمد بەسەر جەهمیەکان وەك حوکمی کافران زۆرە و بەناوبانگە لە کتێبەکانی و کتێبی هاوەڵانی ئەوەشی کە باسمان کرد پوختەیەك بوو ، والله اعلم .

(70) سيرة الإمام أحمد لصالح : (74) .

(71) الفروع : (7/239) .

## پرسی حەوتەم
## وەڵامدانەوەی گومانەکانی پێچەوانان

**وە لە گومانەکانیان :**

1_ **گومانی یەکەم** ئەوەیە کە گوایە ئیمام أحمد دوعای بۆ جەهمیەکان کـردووە و داوای لێخـۆش بـوونی بـۆ کـردوون جـا ئەگەر هەڵـگەڕاوە بوونایە ئەوا دروست نەدەبوو !! .

وەڵامـیش بـۆ ئەوە لەپێشـوودا باسـمان کـرد کە ئیمـام دوعـای لێخۆشبوونی بۆ معتصم و موسڵمانانی تر کردووە بەهۆی ئەوەی کە تەوبەیان کردووە و پەشیمان بونەتەوە ، وە هەرگیز بەهیچ شێوەیەك دوعای بۆ جەهمیەکان و داوای لێخۆشبوونی بۆ نەکردووە تەنانەت یەك بەلگەش نییە بۆ ئەوە بەڵکو بەڵگەکان پێچەوانەی ئەوەن وەك باسمان کرد لەپێشوودا ، لە بەخراپ باسکردنیان و کافرکردنیان و دوعا لێکردنیان لەدوای مردنیان .

2_ **گومانی دووەم** ئەوەی کە ئیمام أحمد ڕێگری کردووە لە دەرچوون لێیـان جـا ئەگەر کـافر بونـایە ئەوا لێیـان دەردەچوو یـاخود بـانگەوازی دەرچوونی دەکرد لێیان !! .

وەڵامیش بۆ ئەوە دەگوترێت ئەگەر دەسەڵاتداران کافر بن مانای ئەوە نییە کە لێیانەوە دەربچین چونکە دەرچوون جیایە مەرجی تایبەتی خۆی هەیە وەك توانا و زۆر مەرجی تر وەك زانایانی خواناس ڕوونیان کردوەتەوە ئەگەر حاکمیش کافر بێت ئەوا مانای ئەوە ناگەیێنێت کە خروجی لێ بگرێت بەهۆی نەڕەخسانی مەرجەکانی خروج .

لەگەڵ ئەوەشدا هاتووە لەوەی ئیمام أحمد بن نصر الخزاعي ئیجتهادی کردووە و خروجی کردووە لە واثق و کەچی ئیمام أحمد بە بیدعەچی لەقەڵەم نەداوە و ناوی نە بردووە بە خارجی وەك مورجیئە کەم ئەقڵەکانی ئێستا دەیکەن بەڵکۆ بە باش باسیشی کردووە وەك لە پێشدا ئەسەرەکە باسکرا .

3_ گومانی سێیەم ئەوەیە کە ئیمام أحمد دەسەڵاتدارانی جەهمیەکانی کافر نەکردووە لەگەڵ ئەوەشدا کە بانگەشەی ئەوەیام دەکرد و خەڵکیان لەسەر سزا دەدا و پێچەوانانیان کافر دەکرد !! .

وەڵامیش بۆ ئەوە ئەوەیە کە ئێمە لە پرسەکانی پێشوودا بەڵگەکانمان هێناوە لە وتە و هەڵوێستی ئیمام أحمد لەسەر تەکفیرکردنی ئەو دەسەڵاتدارانە و تانە لێدانیان و لە ویلایەتیان وەك تەکفیرنەکردنی معتصم ـیش و داوای لێخۆش بوون بۆ کردنی بەهۆی تەوبە و پەشیمانبوونەوەی بوو وەك لە پێشوودا باسکرا .

4ـ **گومـانی چـوارەم** وتنـی ئیمـام أحمـد بـە معتصـم ( ئەی ئەمیـری ئیمانداران.... ) .

وەڵامیش بۆ ئەوە دەگوترێت ئەوە لە بابی سیاسەتی شەرعیە و دەچێتە ژێر باری مەسلەحەت و مەفسەدەت .

شێخ عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن فەرموویەتی: ( سەبارەت بە سـەرەتا دەسـتپێکردنی سـەلام ، ئەوا نابێـت دەستپێشـخەر بێـت بـۆ سەلام کردن لە کافر ، بەڵکو تەحیەیەکی ئەهلی ئیسلامە ، بەلام ئەگەر لە ڕوودانی مەفسەدەیەك ترسا ، یاخود لە دەستدانی مەسلەحەتێك ، ئەوا **هیچی تێدا نییە کە دەستپێشخەر بێت** ، بێگومان لەو کەسانەی کە خۆیـان داوەتە پـاڵ ئیسـلام ، بەڵام شـتێك لە بنەمـا و مافەکـانی ئیسلامی لا شاراوە بێت )[72] .

جـا دەسـەڵاتدارانی ئەو سـەردەم ڕاهـاتبوون لەسـەر ئەوەی پێیـان بگوترێت ئەمیری ئیمانداران جا ئەگەر کەسێکی تر وای نەگوتبا ئەوا لەهەمان کاتدا دەکوژرا .

وە مەبەستی ئیمام أحمد بەرگری کردن بوو لە ئیسلام وە ڕازی کردنی خەلـیفە بـوو بـۆ لابردنـی میحـنەی خەلقـی قـورئان و گەڕانەوەی بـۆ

(72) الدرر السنية : (8/362) .

سوننەت جا ئەگەر أحمد ڕێگری کردبوایە لەقسەکردن لەگەڵی ئەوا مەبەستە گەورەی لەدەست دەچوو .
وە ئەوەشی بەلگەیە بۆ ئەوە ئەوەیە کە ئیمام أحمد بن نصر الخزاعي کاتێك کە دەستگیرکرا بە واثقي دەگوت ئەمیری ئیمانداران لەگەڵ ئەوەی کە بەکۆدەنگی مێژوونوسان گواستویانەتەوە کە کافر کردبوو .

وە دەگوترێت کە بانگ کردنی بە ئەمیری ئیمانداران مانای ئیسلام بوونیان نییە لەوانەشە کافر ئەمیری ئیمانداران بێت لە واقعدا نەك لەشەرع ئەوەش ئەگەر دەستیگرت بەسەر سولتە و دەسەڵات بەهێز و موسڵمانان توانای لابردنی و خروج کردنیان لێ نەبێت .

5_ **گومانی پێنجەم** ( ئەوەیە کە ئیمام أحمد نوێژی لەدوای جەهمیەکان کردووە!! ).
ئەوەش لە لاوازترین گومانە ئەوەی بە پێویست زانراوە لە ئیمامی أحمدەوە کە فەرمانی دەکرد بە ئەنجامدانی جومعە و جەماعەت بەهەر حالێك بێت و بۆ هیچ شتێك وازیان لێ ناهێنرێت ، ئەگەر ئیمامەکەش کافر بێت ئەوا نوێژەکەی لەدوای دووبارە دەکرێتەوە ئەوەش حوکمی ئەو نوێژانەیە کە دەیان کرد لە دوای جەهمیەکان کە دووبارەیان دەکردەوە .

وە لە ڕیـوایەتی دووەمەوە لە ئیمـامی أحمـدەوە هـاتووە کە بەهـیچ شێوەیەك ئەو پێنج نوێژە فەرزە لە دوای جەهمیەکان ناکرێت .
وە سـەبارەت بەو ڕیـوایەتەش کە نوێژیـان لەدوا دەکرێـت و دووبـارە ناکرێتەوە ئەوا هیچ بنەمایەکی نییە ! .

قاضي أبو يعلى فەرموویەتی: ( پرسێك : ڕاجیایی هەبووە لەوەی کە ئایا ئیمـام أحمـد تەکفیـر بە بیروبـاوەڕ دەکـات ئایا نـوێژی جـومعەی لەدوا دەکرێت ؟ جـا مروذي نەقڵی کردووە لە ئیمـام أحمـدەوە سـەبارەت بە ئیمامێـك قسـەی جەهمیەکـانی کـردووە ، فەرمـووی: نـوێژی جـومعەی لەدوا ناکرێـت ، **چـونکە بەو قسـەیەی کـافرە ، وە کـافریش ئیمـامەتی گەورە و بچوکی لادەچێت و نوێژی لەدوا ناکرێت** )[73] .

وە حنبـل بـن اسـحاق فەرمـوویەتی : ( نـوێژەکەی دەکـات و دووبـارەی دەکـاتەوە تەرکـی چـوونی بـۆ جمـعە ناکـات ، وە بە هەمـان شـێوە ابـن منصور نقلی کردووە : بۆ هیچ شتێك تەرکی جومعە ناکرێت ، چونکە لە نیشـانە ئاشـکراکانی دینە ، جـا ئەگەر گوتمـان : نـوێژی لە دوا ناکرێـت

(73) الروايتين والوجهين : (78) .

ئەوا دەچێت بۆ لەکارخستنی نوێژەکە ، وە ناگەڕێتەوە سەر ئەوەی قەزای نوێژەکەی بکاتەوە بە هۆی بەتاڵبوونەوەی نوێژەکەی )[74] .

جا ئەو دوو ڕیوایەتە لە ئیمامی أحمدەوە هاتووە لەسەر ئەو باسە و هیچ بەڵگەیەکی تر بوونی نییە .

بەهەر حاڵ بەهەر شێوەیەك نوێژ لەدوای جەهمیەکان بەتاڵە .

## جا با ڕیوایەتەکان لە ئیمامی أحمدەوە باس بکەین :

1_ عبدالله لە سونەتدا فەرموویەتی: ( گوێم لە باوکم بوو دەیفەرموو : **ئەوەی ئەو قسەیە بکات نوێژی جومعە و نوێژەکانی تری لە دوا ناکرێت ، ئێمە بەدروستی نازانین چوون بۆ جومعە و نوێژەکانی تر ، بەڵام ئەگەر نوێژی لەدوا کرد ئەوا نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە** ، وە پرسیارم کرد لە باوکم سەبارەت بە نوێژکردن لەدوای بیدعەچیان ، فەرمووی: نوێژیان لەدوا ناکرێت وەك: **جەهمیەکان و موعتەزیلەکان**)[75] .

2_ ئیمام ئەبوو داود فەرمویەتی : ( بە ئیمامی أحمدم گوت لەو کاتانەی کە نوێژی بەکۆمەڵی لەگەڵ جەهمیەکان دەکرد ، پیم گوت :

(74) مسائل الفقهية للقاضي أبي يعلى .

(75) السنة لعبدالله لاپەڕە : (1) .

ئایە جومعەش ؟ فەرمووی: **من دووبارەی دەکەمەوە ، وە هەر کاتێك نوێژ بکەم لەدوای کەسێك بڵێت قورئان مەخلوقە نوێژەکەم دووبارە دەکەمەوە** ، گوتم بە ناسینی ؟ فەرمووی: بەڵێ )[76] .

سبحان الله ئیمام أحمد نوێژی پوچەڵ کردۆتەوە بە ناسینی ئیمامی جەهمی جا چۆن دەگوترێت دروستە نوێژ لەدوای جەهمیەکان بکرێت موسڵمانن !! .

3ــ حەربی کەرمانی نەقلی کردووە و فەرموویەتی : ( مەزهەبی ئیمامی أحمد ئەوەیە کە نوێژ لە دوای **هەوەڵانی بیدعەچیان** ناکرێت )[77] .

4ــ ئیمام ابن هاني النیسابوری فەرموویەتی : ( پرسیار کرا لە ئیمام سەبارەت بە نوێژکردن لەدوای جەهمیەکان ، فەرمووی : **نوێژیان لە دوا ناکرێت** و هیچ ڕێزێکیان بۆ نییە )[78] .

5ــ قوتابییەکەی أحمد عباس بن عبدالعظیم فەرموویەتی: ( کە پرسیاری کردووە لە باوکی عبدالله ، لەبارەی نوێژکردن جومعە لەدوای موعتەزیلە ، فەرمووی: سەبارەت بە جومعە ئەوا ئامادەبوونی

(76) مسائل ابو داود : (64) .

(77) مسائل حرب الكرماني : (525) .

(78) مسائل ابن هاني : (96) .

پێویستە ، جا ئەو کەسەی نوێژیان لەدوا بکات **نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە** )[79] .

6_ قوتابییەکەی أحمد أبي طالب فەرموویەتی: ( گوتم بە أحمد: ئەوەی نوێژی ساڵێك بکات لەدوای کەسی جەهمی ئایا نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە ؟ فەرمووی: **بەڵێ دووبارەی دەکاتەوە ساڵێك و دووساڵیش بێت** ، هەرکاتێك نوێژی لەدوا بکات دووبارەی دەکاتەوە ، وە فەرموویەتی: نوێژ ناکرێت لەدوای کەسی جەهمی ، مەگەر نوێژی جومعە بێت ، ئەگەر نوێژی جومعەی لەدوا کرد نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە )[80] .

7_ قوتابی أحمد سعید بن ابي سعید فەرموویەتی: ( گوێم لێبوو پرسیارکرا لە أحمد دەربارەی نوێژکردن لەدوای بیدعەچیان ، فەرمووی: **جەهمیەکان نوێژیان لەدوا ناکرێت** )[81] .

8_ قوتابییەکەی أحمد شاهین بن السمیذع فەرموویەتی: ( پسیارم کرد لە باوکی عبدالله گوتم: نوێژ بکەم لەدوای کەسی جەهمی ؟ فەرمووی: **نوێژ مەکە لەدوای کەسی جەهمی و لەدوای کەسی رافضي** )[82] .

---

(79) المغني : (4/414) .

(80) السنة لإبن شاهين : (20-21) .

(81) طبقات الحنابلة : (1/168) .

9_ ابو بكر الآجري فەرموویەتی: ابو بكر محمد بن هارون العسكری بۆی باسکردین فەرمووی: محمدی کوڕی يوسف بن طباع فەرموویەتی: ( گوێم لە پیاوێك بوو پرسیاری کرد لە ئیمامی أحمد ، فەرمووی: ئەی بـاوکی عبـدالله ئایـا نـوێژ بـکەم لەدوای کەسـێك کە بێهۆشـکەر دەخـواتەوە ؟ فەرمـووی: نەخێـر ، فەرمـووی: ئەی نـوێژ لەدوای ئەو کەسـە بـکەم کە دەڵێـت قـورئان مەخلـوقە ؟ فەرمـووی: سـبحان الله ڕێگریـت لێـدەکەم لە نـوێژ کـردن لەدوای موسـڵمان کەچـی **پرسـیاری نوێژکردنم لەدوای کافر لێدەکەیت!** )[83] .

10_ عبدالله فەرموویەتی: ( أحمد بن ابراهيم الدورقي بۆی باس کردم ، فەرمووی: گوێم لە ابا عبيد قاسم بن سلام بوو دەی فەرموو :گەر پەنجا کەس لەڕۆژی جـومعەدا ئیمـامەتی بـکەن بـۆ خەڵکـی نەلـێن قـورئان مەخلـوقە و هەنـدێکیان فەرمـان بە هەنـدێکی تریـان دەکەن بـۆ ئیمـامەتی ، ئەوەیە ئەگەر سـەرگەورەیان فەرمانیـان پێـدەکات و ئەو قسەیە دەکات من دووبارەکردنەوەی نوێژەکەی دەبینم چونکە جومعە بە سـەر ( ئیمـام ) جێگیـر دەبێـت ، جـا قسـەکەی ابـا عبيـد م بەبـاوکم گـوت ، فەرمـووی: ئەوە لەسـەر خەڵکـی گـران دەکـات ، ئەگەر ئەو

(82) طبقات الحنابلة : (1/172) .

(83) الشريعة للآجري : (173) .

کەسەی نوێژمان پێ دەکات هیچ شتێك ناڵێت لەو شتانە ( خەلقی قورئان ) ئەوا نوێژی لەدوا دەکەم وە ئەگەر ئەو کەسەی نوێژمان بۆ دابیەستێت هیچ قسەیەك لەو قسانە بکات نوێژەکەم دووبارە دەکەمەوە لەدوای )[84] .

جا سەیرکەن ابا عبید سەرگەورەی جەهمی کافر کرد و دواتریش حوکمی بە بەتاڵ بوونەوەی نوێژەکردنی لەدوای داوە بەبێ سەیرکردنی دڵیان وە ئیمام أحمد وەلامی دایەوە و بەلام وەلامی نوێژنەکردن لەدوای جەهمی و کافر کردنیان نەدایەوە ، چونکە ئەوە ئەو هەقە کە سەلەف کۆدەنگیان هەبووە لەسەری .

11_ امام ابو بکر المروذي نەقڵی کردووە لە ئیمامەوە کە حوکمی داوە بەسەر هشام بن عمار بەوەی جەهمیە و فەرموویەتی: ( ئەگەر نوێژیان لەدوا کرد **با نوێژەکەیان دووبارە بکەنەوە** )[85] .

وە پوچەڵ بوونەوەی نوێژ لەدوای جەهمیەکان لەگەڵ چوونی بۆ نوێژەکە و دووبارەکردنەوەی ئەگەر جومعە و جەماعەتبوو زۆر ڕوونە و زانراوە لە لای زانایانی حەنبەلی تایبەت پێشینەکان .

(84) السنة لعبدالله : (75) .

(85) ميزان الاعتدال : (7/87) .

ئیمـام بربهـاری لە شـرح السـنة دا فەرمـوویەتی: ( پێـنج نـوێژە فەرزەکە دروســتە لە دوای کــێ دەیکەیــت بــیکە مەگەر جەهمــی بێــت ئەوا پــەکخەرە و ئەگەر نـوێژت لەدوای کـرد نـوێژەکەت دووبـارە بـکەوە وە ئەگەر ئیمـامەکەت لەڕۆژی جـومعەدا جەهمـی بـوو و دەسـەڵاتدار بـوو ئەوا نوێژ بکە لەدوای ، وە **دواتر دووبارەی بکەوە** )[86] .

وە ابن رجب الحنبلی فەرموویەتی: ( ئیمام أحمدیش بەهەمان شێوە ، دەربــارەی نــوێژ کــردن لەدوای جەهمیەکــان فەرمــوویەتی: **دووبــارە دەکــرێتەوە ، وە کەســی جەهمــیش لای ئەو ئەو کەســەیە کە بڵێــت قورئان مەخلوقە ، ئەوەش کافرە** )[87] .

شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن لە وەڵامی ئەو گومانە فەرموویەتی : (ئیمام أحمد هاوشێوەیانی لە ئەهلی علم و حەدیس ، **ڕاجیاییان نییە** لە تەکفیرکردنــی جەهمیەکــان وە بەوەی کە گــومڕا و زەنــدیقن ، وە لەکۆمەڵیەکەوە لە سونەتدا باسی کافرکردنیان کراوە لە تێکڕای ئەهلی علــم و ئەســەر ، وە لالکــائی زۆری لێیــانەوە ژمــاردووە باســکردنی لەو نامەیەدا زۆر ئەستەمە ، وە بەهەمان شێوە عبدالله بن ئیمام أحمد لە

(86) شرح السنة : ص (49) .

(87) شرح العلل الترمذی لابن رجب : (123/1) .

کتێبەکەی سونەتدا وە خلال و ابن ابی ملیکة لەکتێبی سونەتدا ، وە ئیمام ابن خزیمە تەکفریانی کردووە و لە گەورەیانی ئومەتەوە نەقڵی کردەوە ، وە شمس الدین ابن القیم لە کافیەتەکەی باسی کافرکردنیانی کردووە لە پێنج سەد زانا و گەوەرەیانی موسڵمانانەوە ، وە نوێژکردنیش لەدوایان بێگومان بەنوێژی جومعەشەوە ، نابێتە هۆی ئەوەی کە ڕەتی کافرکردنیان بداتەوە ، بەڵام پێویستە دووبارە بکرێتەوە لەکاتێکدا کە ناتوانرێت نوێژ بکرێت لەدوای غەیری ئەوان ،........لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی علم **کۆدەنگن لەسەر تەکفیرکردنیان و نوێژکردن لەدوای کافرێکی جەهمی دروست نییە** ، وە ئیمامی أحمد بە ڕوونی ئەوەی کردووە ، لەوەی عبداللە ی کوڕی و غەیری ئەویش لێیەوە نەقڵیان کردووە ، کە نوێژی جومعە و نوێژەکانی تری دووبارە دەکردەوە )[88] .

وە ئیمام نوێژەکانی دووبارە دەکردەوە لەدوای جەهمیەکان تا ئەوکاتەی متوکل دەسەڵاتی گرتەدەست و بەڵاو میحنەکەی بنەبڕ کرد . وە حنبل بن اسحاق فەرموویەتی: ( أحمد نوێژەکانی دووبارە دەکردەوە تا ئەوکاتەی کەوا متوکل دەسەڵاتی گرتەدەست و ئەو قسانەی بنەبڕکرد و دوای ئەوە نوێژەکانی دووبارە نەدەکردەوە )[89] .

(88) الدرر السنية : (10/422) .

(89) ذكر المحنة : (70) .

وە تەنها ئیمام أحمد وای نەکردووە بەڵکو چەندانی تر لەگەورە زانایان وەکو یحیی کوڕی معین بە هەمان شێوەی ئیمام أحمدی دەکرد .

عبدالله فەرموویەتی: ( أحمد بن ابراهیم بۆی باس کردم یحیی بن معین پێی گوتم: نوێژی جومعە **دووبارە دەکەمەوە** لەو کاتەوەی عبدالله بن هارون مەئمون خەڵقی قورئانی دروست کردووە و بڵاوی کردووەتەوە )[90] .

بۆیە پشت بەستن بە نوێژکردنی ئیمام أحمد لەدوای جەهمیەکان بۆ ئەوەی تەکفیریانی نەکردووە باتڵە ، وە لە پێشوشدا باسمان کرد و بەڵگەکانمان هێناوە کە هۆکاری نوێژکردن لەدوایان و دووبارە کردنەوەی ئەوە بووە کە کافربوونیانی دیووە .

(90) السنة لعبدالله : (76) .

## پرسی هەشتەم

## هەندێك بەڵگە لەوتەی زانایانی سەلەف و خەلەف بۆ سەلماندنی ئەوەی باسمان کرد

بزانە ڕەحمەتی الله تعالی لەسەرت بێت کە ئەو کەسەی تاك تاکی جەهمیەکان کافر نەکات ئەوا وەك خۆی کافرە و نوێژی لەدوا ناکرێت ئەوەش لە ڕوونترینی باسەکانە لای سەلەف و تەکفیری ئەو کەسەیان کردووە لە جەهمیەکانی کافر نەکردووە فەرمانیان کردووە بەوەی نوێژ لەدوای ئەو کەسە نەکەن کە جەهمیەکان کافر ناکات .

ئیمام أبو عبيد القاسم بن سلام فەرمویەتی: (سەیری قسەی جولەکە و مەجوسم کرد نەمبینی گەورەتر لەکوفری ئەوانە ( واتە جەهمیەکان ) ، وە ئەو کەسانە بەنەزان و نەفام دادەنێم کە کافریان ناکەن مەگەر ئەو کەسە نەبێت کە ئاگاداری کوفرەکانیان نییە )[91] .

زیاد بن أیوب فەرموویەتی: ( ئەوەی بلێت قورئان مەخلوقە ، ئەوا **کافرە** ، هیچ گومانی تێدا نییە ، پێی گوترا: ئەی ئەو کەسەی کافریان نەکات ؟ ئایا قسەی لێوەردەگیرێت ؟ فەرمووی: **نەخێر ، هیچ ڕێزێکی بۆ نییە** ، پێی گوترا: ئاخر نزیکایەتیم لەگەڵیان هەیە: چاکەیان لەگەڵ

(91) مجموع الفتاوى : (509/12) .

بــکەم و ســەلامیان لــێ بــکەم ؟ فەرمــووی: **نەخێــر ، وە ئامــادەی جەنازەکەیان مەبە ، وە سەردانیشیان مەکە )** [92] .

وەك دەبینـین ئـیم زیـد رحـمە اللە فەرمـانی کـردووە بەو کەسـە کە ئامادەی جەنازەی ئەو کەسانە نەبێت کە جەهمیەکان کافر نەکات و سـەردانیان نەکـات و گوێیـان لـێ نەگرێـت لەکاتێکـدا ئەو کەسـانە نزیکەکانین ئایا ئیمام پێی گوت نەخێر تاوەك اقامە حجەیان نەکەیت ئامـادەی جەنازەیـان مەبە و سـەردانیان مەکە ؟ ئەو اقـامە حـجەیە و عوزر هێنانەوەتان بۆ چییە بۆ کەسانەی کە موشریکان تەکفیر ناکەن ؟ ئەوەش لە کاتێکـدا کە ئەو باسـانە خفـین ( شـاراوەن ) ئەی چـی سـەبارەت بەو کەسـەی کە موشـریکان و طاغوتـان و شـوێنکەوتوانیان گۆڕپەرسـتان و سـەرخەرانی کـافران بەسـەر موسـڵمانان کـافر نـاکەن ؟ لەکاتێکـدا تەکفیرکردنـی ئەو کەسـانە بە پێوسـیت زانـراوە لەدیـن و ئەصڵی دینە و هیچ کەسێك عوزری نییە تیایدا ؟.

أبو حاتم الرازي فەرموویەتی: ( ئەوەی وابزانێت قورئان مەخلوقە ئەوا **کافرە بە کوفرێك کە لەمیلەتی دەباتەدەر** ، وە ئەوەشی گومانی هەبێت لە کـافربوونی لەو کەسـەی تێـدەگات و **جاهیـل نیـیە ئەوا کـافرە** ، وە

(92) طبقات الحنابلة : (156/1) .

ئەوەشی جاهیل بێت فێردەکرێت جا **ئەگەر ملکەچی هەق بوو بە کافرکردنی ئەگەرنا خۆی توشی کوفر دەبێت** )[93] .

یحیی بن خلف المقرئ فەرموویەتی: ( هاتم بۆ کوفە و چاوم کەوت بە أبا بکر بن عیاش ، پرسیارم لێکرد: چی دەڵێ دەربارەی ئەو کەسەی بڵێت قورئان مەخلوقە ؟ فەرمووی: **کافرە** ، وە هەموو کەسێکیش نەڵێت: ئەو کافرە ئەوا **خۆیشی کافرە** ، ئینجا فەرمووی: ئایا گومان دەبرێت لەوەی کەسی گاور و جولەکە کافر بن ؟ جا ئەوەی گومانی هەبێت لە کافریەتی ئەو کەسانە ، ئەوا کافرە ، وە ئەوەشی دەڵێت: **قورئان مەخلوقە وەك ئەوانەیە** )[94] .

أبو بکر بن عبد الخالق فەرموویەتی: ( پرسیارم کرد لە عبدالوهاب الوراق دەربارەی ئەو کەسەی جەهمیەکان کافر ناکات ، فەرمووی : **نوێژی لەدوا ناکرێت ئەوە گومڕا و سەرلیشێواوە و موتەهەمە لەسەر ئیسلام** ، وە پرسیارم لێ کرد: لەگەڵ ئەو کەسە دانیشتن و کۆبونەوە دەکرێت کە جەهمیەکان کافر ناکات ؟ فەرمووی: **نەخێر ، دانیشتن و**

(93) طبقات الحنابلة : (287/1) .

(94) السنة لحرب الكرماني : (375) .

**کۆبونەوەیان لەگەڵ ناکرێت و قسەیان لەگەڵ ناکرێت مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی )**[95] .

داود بن الحسين البيهقي فەرموویەتی: ( پێم گەشتووە کە الحلواني گوتویەتی: ئەو کەسە کافر ناکەم کە بوەستێت لەوەی بلێت قورئان مەخلوقە یاخود نا ، داود فەرمووی: جا پرسیارم کرد لە سلمة بن شبيب دەربارەی زانستی حلواني ، فەرمووی: **فڕێ ئەدرێتە ناو پۆلای ئاگرەوە ، ئەوەی شایەدی کافربوونی کافر نەدات کافرە )**[96] .
سبحان الله حلوانی ئەو کەسەی کافر نەدەکرد کە لە قورئان بوەستابوایە کەچی سەلەمە حوکمی کوفری بەسەردادا ئەی چی سەبارەت بەو کەسەی کە ئەو کەسە کافر ناکات کە بڵێت قورئان مخلوقە ؟ ئا ئەوەیان ئەولاترە کە کافرە .

ئیمامی اللالكائي دوای ئەوەی کۆدەنگی نەقڵ دەکات ووتەی (550) ئیمامی هێنایەوە لەسەر کافرکردنی ئەو کەسەی بڵێت قورئان مخلوقە ، فەرموویەتی : ( ئەگەر سەرقاڵ ببوایەم بەهێنانەوەی وتەی زانایان ئەوا ناوەکانیان دەگەیشت بە بەچەندین هەزار هەزار ، بەڵام کورتم

(95) الورع : (89/1) .
(96) شرح أصول الاعتقاد : (198/1) .

کــردۆتەوە و ســەنەدەکانم ڕەشــکردۆتەوە بــۆ کــورتکردنەوەی و زۆر درێژنەکردنەوەی ، وە لەو زانایـانەوە سـەردەم لەدوای سـەردەم نەقڵـم کردووە و هیچ **کەسێك نکۆڵی لە قسەکەیان ناکات ، ئەوەشی نکۆڵی بکات لە قسەکەیان ئەوا داوای تەوبەیان لێ دەکرد ، یاخود فەرمانیان دەکرد بە کوشتنی یاخود دەرکردنی یاخود لە خاچ دانی )**[97] .

ابـن طـاهر المقدسي فەرمـوویەتی: ( بـۆ أبي بكـر السمسـار لە أصـبهان خوێندمەوە ، من جعفر الفقیه هەواڵتان پێ ئەدەم ، فەرمووی: پرسیارم کرد لە أبا القاسم سلیمان الطبراني: چی دەڵێی سەبارەت بەو کەسەی دەڵێت: ئەهلی تەوحید لە ئاگر دێنە دەرەوە تەنها ئەو کەسە نەبێت کە دەڵێت: **قورئان مەخلوقە** ؟

لە وەڵامـدا فەرمـووی: **ئەوەی بڵێـت قـورئان مەخلـوقە کـافرە بەخـوای باڵادەسـت بەبێ هـیچ ڕاجیـاییەك لە نێـوان ئەهلـی سـونەو زانسـتدا ،** چونکە وای زانیوە کە الله تعالی مەخلوقە ، چونکە قورئان قسەی الله یە و قسـەی پێکـردووە و جـوبریلیش قسـەی پێکـردووە لەگەڵ ڕۆحـی ئەمین ، وە جبریلیش بەوشێوەیە لەلایەن الله تعالی وە دایبەزاندووە ، الله تعــالی فەرمــوویەتی: { نــزل بــه الــروح الأمــین }، وە جوبریــل

(97) شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة : (2/312) .

دایبەزاندووە بەسەر دڵت ، ئەوەی بڵێت: مەخلوقە ، ئەوا پیسترە لە گاور و جولەکە و بت پەرستان ، وە لەئەهلی تەوحید و موخلیسان نین کە الله تعالی کردویانەتیە ناو ئاگرەوە وەك سزایەك بەهۆی کردەوەیەك کە شایستە بوون بۆ چوونە ناوی ئاگر ، جا الله تعالی لە ئاگریان دەردەهێنێت بە ڕەحمەتی خۆی و شەفاعەتی پێغەمبەرەکەی محمد (صلی الله علیە وسلم) ، وە شەفاعەتکاری شافیعان ، **وە ئەوەی وابزانێت ئەو کەسەی بڵێت: قورئان مەخلوقە لە ئاگر دێتە دەرەوە ئەوا کافرە وەك ئەوە وایە بلێت گاور و جولەکەکان لە ئاگر دێنە دەرەوە )**[98] .

جا ئەوەی کەسی جەهمی کافر نەکات ئەوا بێگومان بە موسڵمانی دەزانێت ئەگەر بە موسڵمانیشی بزانێت ئەوا بێگومان دەلێت لە ئاگر دەردەچێت ئەوەش وەك ئیمام گوتی بەبێ گومان کافرە .

وە پرسیارکرا لە شێخ عبدالله و شێخ إبراهیم کوڕانی شێخ عبداللطیف و شیخ سلیمان :

**دەقی پسیار/** وتەی زانایانی موسڵمانان و پێشەوای تەنها الله پەرستان چییە سەبارەت بەئیمامەتی پیاوێك کە دەربارەی جەهمیەکان و

(98) الحجة علی تارك المحجة : (484/2) .

گۆڕپەرستانی نکۆڵیکەر لە تەوحیدی ذات و صیفات و تەوحیدی عیبادەت وەك زۆربەی خەڵکی دوبەی و ابوظبی و دوو قسەیان لەسەرە ، بەوەی کە اقامە حجەیان پێ نەگەشتووە وە کاتێك پرسیاری لێکرا چۆن ئێمە بەوان جووین گوتی ئەوان موسڵمانن و......هتد ؟ ساڵی 1325 .

فەرموویان : بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله وحده
**وەڵام / دروست نییە ئیمامەتی کەسێك کە جەهمیەکان و گۆڕپەرستان کافر نەکات یاخود گومانی هەبێت لە کافربوونیان .**
وە ئەو بابەتەش لەڕوونترینی بابەتەکانە لای فێرخوازانی زانستی شەرعی و ئەهلی ئەثەر .

وە پرسیار کرا لە شێخ عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن سەبارەت بەوەی هەندێك لە مولحیدان ئەوەیان داوەتە پاڵ ابن تیمیە کە باسی ئیمام أحمدی کردووە کە ئیمام أحمد نوێژی کردووە لەدوای جەهمیەکان .......هتد ؟
لە وەڵامدا فەرمووی : ( وەڵامی ئەوەش لەو باسە ئەوەیە لەڕوونترینی باسەکانە لای فێرخوازانی زانستی شەرعی و ئەهلی ئەثەر ، بەوەی ئیمام أحمد و هاوشێوەیانی لە ئەهلی علم و حەدیس ڕاجیاییان نییە لە

تەکفیرکردنـــی جەهمیەکـــان وە بەوەی کە گـــومڕا و زەنـــدیقن ، وە لەکۆمەڵیەکەوە لە سونەتدا باسی کافرکردنیان کراوە لە تێکڕای ئەهلی علـم و ئەثەر ، وە لالکـائی زۆری لێیـانەوە ژمـاردووە و باسـکردنی لەو نـامەیەدا زۆر ئەستەمە ، وە بەهەمـان شێوە عبدالله بـن امـام أحمـد لە کتێبەکەی سونەتدا وە خلال و ابن ابی ملیکة لەکتێبی سونەتدا ، وە ئیمـام ابـن خـزیمە تەکفریـانی کـردووە و لە گەورەیـانی ئومەتەوە نەقڵی کردەوە ، وە شمس الدین ابن القیم لە کافیەتەکەی باسی کافرکردنیانی کردووە لە پێنج سەد زانا و گەوەرەیانی موسڵمانانەوە ، وە نوێژکردنیش لەدوایـان بێگومـان بەنـوێژی جومعەشـەوە ، نـابێتە هـۆی ئەوەی کەوا ڕەتی کافرکردنیان بداتەوە ، بەڵام پێویستە دووبارەبکرێتەوە لەکاتێکدا کە ناتوانرێـــت نـــوێژ بکرێـــت لەدوای غەیـــری ئەوان ، وە ڕیـــوایەتی بەناوبانگ و ڕوون لە ئیمام أحمدەوە بریتییە لە ڕێگری کردن لە نوێژ کـردن لەدوایـان ، وە لەوانەیە جیـاوازی هەبێت لەنێـوان ئەو کەسـەی اقامە حجە کراوە کە بەهۆیەوە کافر ببێت ولەنێوان ئەو کەسەش کە هیچ ئاگای لەو باسە نییە ، **وە ئەو وتەیەش ابـن تیمیە لەو باسـانەدا بۆی دەچێت کە شاراوەن لەلای هەندێ کەس** ، وە لەسەر ئەوە قسەی جەهمیەکانی ئەو سەردەمە حجەیان پێگەشتووە و بەڵگەکان دیارن ، وە زانیویانە کە ئەهلی سوننە لەسەر چین و فەرموودەکانی پێغەمبەر

(صلی الله علیه وسلم) بڵاوبونەتەوە ، وە بەشێوەیەك بڵاوبوەتەوە کە هیچ شتێکی لەدوا نییە مەگەر خۆبەگەورەزانین و عینادی نەبێت لەدواوە نەبێت ، وە ئەوەش هەقیقەتی کوفر و بێدینیە چۆن نا ؟ لەکاتێکدا قسەکانیان بریتییە لە پەکخستنی ذات و صیفەتەکانی الله ، وە کوفر کردن بەوەی پەیام و پێغەمبەران لەسەری کۆدەنگن ، وە فترەتی پاك شایەدی بۆ داوە ، کەوا لەگەڵیدا هیچ هەقیقەتێکی ربوبیەت و ئولوهیەت نامێنێتەوە ، وە ذاتی پیرۆز بوونی نییە کە وەسفکراوە بە صیفاتە جوانەکان ، وە ئەوان بەبێ گومان شتێك دەپەرستن کە هیچ بوونی نییە ، وە پشت دەبەستن بە خەیاڵات و گومان ، کە بێ بنەمایی دەزانرێت بە پێویستی ئەقڵ ، وە بە پێویستی لەدینی ئیسلام ، لای ئەو کەسەی زانیبێتی و ئەوەشی زانیبێت کە پێغەمبەران بۆی هاتوون لە سەلماندنی ئەو باسانە ، وە بەشری مەریسی و هاوشێوەکانی چەندین گومان و قسەیان هەیە لەسەر پەکخستنی صیفەتەکان ، کە لەو باسەیە کە لای جەهمیە سەردەمیەکانیش هەیە ، بەڵکو هەموو ئومەتێك بێدینیان کەمترە لەوانە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی علم کۆدەنگن لەسەر تەکفیرکردنیان و نوێژکردن لەدوای کافرێکی جەهمی دروست نییە ، وە ئیمامی أحمد بە ڕوونی ئەوەی کردووە ، لەوەی عبدالله ی کوڕی و غەیری ئەویش

لێیەوە نەقڵیان کردووە ، کە نوێژی جومعە و نوێژەکانی تری دووبارە دەکردەوە )[99] .

ئەوەی مەبەست بوو باسکرا ، والله تعالى اعلم .
وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .

(99) الدرر السنية : (10/422) .

# ناوەڕۆك